یەکەمین گۆڤاری کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
لە کوردستاندا

34

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار



مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی سییەم ئازاری - ٢٠١١

تەنها خولەکێك!!

خۆشەویستی فرمێسك دەڕێژێت..
بەڵام وانەی وەفاداریمان فێردەکات!

گوفتار کرۆکی کردار

نازدار

با گوڵ بکەین بە نەریت!

دڵی شوشەیی

دیکتاتۆرەکەت بڕوخێنە!

The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

لە پێناو گەلێکی خاوەن بڕیاردا

# بڕیار

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی

ساڵی سێیەم - ژمارە 34 - ئازاری 2011







ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم

بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە

٣١٩٣٩٤٦ ٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢

E-mail: bryarmagazin@gmail.com

هەولێر ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

چاپ: کۆمپانیای پیرەمێرد

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە و بازرگانی گشتی

نرخ 2500 دینار

# هەر کەسێک حەق ببینێ‌و
# لچکێکی نەگرێت، ترسنۆکە

کۆنفۆشیوس






ئەم لاپەڕەیە بە سپۆنسەری

گرووپی کۆمپانیاکانی ڕەسەن بڵاو دەکرێتەوە

# نابێت دوا بکەوین

زۆرگرنگە مرۆڤ بە کەنارگیری نەژیو بەرامبەر ڕووداوو گۆڕانکارییەکانی دونیاو داواکارییەکانی ژیانی هاوچەرخ، نەعامە ئاسا سەری لە نێو لمی وەهمدا نوقم نەکات!

بەڵکو بە پێچەوانەوە چاوێکی بکات بە چوارو بەوپەڕی هزری وردو بیری تیژەوە بەشێکی پۆزەتیڤی هاوکێشەی گرنگی ڕووداوەکان بێت، چونکە کاتێك مرۆڤ لە دەرەوەی بازنە ڕاستەقینەکەداو لە نێو بازنەیەکی بەتاڵی خۆیدا دەسوڕێتەوە، هیچ خودسازیو ئامادەباشییەکی پێشینەو بەرنامەو پلانێکی پێ نابێت، تەنها دەبێت بە چاوێکی ئەبلەقەوە بۆ چاوەڕوانیکردنی ڕووداوی جەرگبڕی کتوپڕو پڕ لە هەڵدێرو موفاجاتی ناخۆش بنوارێتو خۆی بداتە دەست ڕێگای هاتو نەهات.

ئەمرۆ تۆڕەکانی پەخشو بڵاوکردنەوەو میدیاو ڕاگەیاندنەکان هەموو دنیایان بە یەکەوە گرێ داوە، بەشێوەیەك ژیان دوور لەم سیستەمە جیهانییە نوێیە، زۆر ئەستەمو مەحاڵە.

ئەمرۆ ناتوانرێت چیدی پەیڕەوی ئەو پەندە بکەین کە دەڵێت: (الباب الذی یجیك منه ریح، سده واستریح)، بەڵکو بە پێچەوانەوە ڕۆژ بە ڕۆژ دەرگای نوێ دەکرێتەوەو هەموو دەرگا داخراوەکانیش واڵا دەکرێن.

ئەمرۆ گۆڕانکارییە جیهانییەکان بێ ویستو ئیرادەی خۆمان کاریگەری لەسەر هەموو کونو قوژبنێکی ئەم جیهانە بەجێدەهێڵێت.

تەنانەت کۆمەڵگا سادەکانو دانیشتوانی وڵاتانی جیهانی سێیەمیش لە ڕێگای زیادبوونی پێویستی بۆ خوێندنەوەو فێربوونو شارەزابوون، داواکارییەکانیان بەرەو باشترو ئاواتەکانیان گەورەتر هەنگاو دەنێت.

لەم سەردەمی خێرایی لە هەموو شتێکدا، بە تایبەت لە بواری پێشکەوتنی هەمە لایەنەدا، بە هۆی فراوانی ئاسۆی پێشکەوتنەوە سنوری نەزانین زیاد دەکاتو مرۆڤ زیاتر پێویستی بە زانیاریو ماریفەتو بیرۆکەی نوێ دەبێت.

دواکەوتنیش لە کاروانی پێشکەوتن لە قازانجی هیچ تاكو کۆمەڵگەیەکدا نییە، چونکە ئەو کاروانە خێرایە بەوەندەوە ناوەستێت لە دوای کاروانەوە بە جێمان بهێڵێت، بەڵکو چەندین قۆناغ دوادەکەوینو ژیانێکی نامۆ بەسەر دەبەین!

مرۆڤیش بە سروشت کۆمەڵایەتیەو زۆر بە خێرایی هۆگری خوشكو براکانی دەبێتو دەتوانن بە ناخی یەکتردا ڕۆچنو لە ڕۆحی یەکتردا بتوێنەوە، ئەمەش وەهای کردووە گواستنەوەی بیروڕاو بۆچوونەکانو لێکگەیشتنو پێکگەیشتن زۆرئاسان دەبێت.

تەماشاکردنی نەتەوەیەك، یا کۆمەڵگەیەکی دی وەکو پێشەنگو ڕابەرێك لاسایی کردنەوەو چاولێکەری نییە، بەڵکو کارێکی زۆر ئاساییە، چونکە ئەو پێشەنگە دەستپێشخەربووەو پێش ئێمە گەیشتووە بە قۆناغێك کە مافی خۆیەتی شەرەفی پێشەنگی پێ بدرێت.

ئەگەر کۆمەڵگەیەك داواکاریو هەواداریو ئاواتەکانی گەیشتبێتە ئاستی داواکردنی ئازادیو کەرامەتو ژیانی پرشکۆی ئینسانی کە تا دوێنێ تەنها داواکانی لە چوارچێوەی چەند داواکارییەکی ماددی سەرەتاییدا خۆی دەبینییەوە، دەبێت سەرەتا تیری ڕەخنە بگرێتە خۆی!!

لە مێژیشەوە گوتراوە ئازادی وەرناگیرێت، دەسەنرێت! کاتێك کە دەبێتە داواکاری یەکەمی مرۆڤەکان ئیتر ئیمپراتۆری فارسو ڕۆمیش لە بەرامبەریدا ناتوانن بووەستن.

ئەو ئارەزووانەی کە خوداوەند لە غەریزەی مرۆڤەکاندا دروستی کردووە، بە هەموو جیهان کۆنترۆڵ ناکرێن، هەموو هێزی دونیا ناتوانێت نەهێڵێت مرۆڤەکان، بخۆنو بخۆنەوەو خەونو ئارەزووەکانیان بەدیبهێنن.

ئەو کاتەش ئازادیو دادپەروەری دەبنە ئارەزوو ئاواتی مرۆڤەکانو ڕازی نابن دەستبەرداری بن ئیتر چی هێزێك دەتوانێت زەوتی بکات؟!

ئاسانترینو هێمنترین گۆڕانکاریش ئەوەیە کە مرۆڤەکان خۆیان بگەنە ئەو ئاستەو بە هۆی کامڵبوونی ماریفەتو زانیاریو تێگەیشتنیانەوە تێڕوانینیان بۆ ژیانو دەوروبەر گۆڕا بێت.

ئەو کاتەش سەرکەوتن بەدیدێت کە داواکارییەکان هەڵقوڵاوی ناخی مرۆڤەکان بنو بە قەناعەتەوە، بە ویستو ئیرادەوە، بە فیکرو بەرنامەوە قوربانی لە پێناودا بدەن!

یەکلاییکردنەوەی ڕووداوەکانیش دەبێتە شتێکی حەتمی وەختێك گەل خۆی خاوەنی هاوکێشەکەیە، چونکە هەموو بزوتنەوەیەك بۆ گەیشتن بە سەرکەوتنو چەسپاندنی ئامانجەکانی پشت بە گەل دەبەستێت، بەڵام کاتێك گەل خۆی خاوەنی مەسەلەکەیە جگە لە خودای گەورە پێویست ناکات پشت بە کەس ببەستێت!

کاتێك گەل خاوەن بڕیاری خۆی دەبێت، دەتوانێت لە دژوارترین بارودۆخدا بڕیاری خۆی هەڵبژێرێت.

غاندی بەرامبەر پرسیارێك سەبارەت بە ئەگەری ڕزگاربوونی وڵاتەکەی لە داگیرکردنی بەریتانی گوتی: ئێمە خۆمان ڕێگامان دا ئینگلیز وڵاتەکامان داگیر بکات، هەر کاتێکیش بمانەوێت دەتوانین دەری بکەین!

لە کۆتایشدا قسەکەی ئەو دەرچوو!

لە نامەیەکیشیدا بۆ ئەندێرای کچی دەڵێت: ڕژێمی دادپەروەر وەکو ئەو باوکە وایە کە وەکو خێزانو کوڕو کچی خۆی مامەڵە لەگەڵ گەلەکەیدا دەکاتو دوای مردنی خۆشی نیگەرانی چارەنووسی ئەوانەو خەمی ژیانی ئەوان دەخوات.

بەڵام ڕژێمی دیکتاتۆر وەکو دەزگیرانەکەی تەماشای گەلەکەی دەکات، کە دەبێت یان بۆ ئەو بێت، یا بۆ مردن!

# کارگێڕی بە گوفتار

هەژاری خۆشترە، لە منەتباری!

ئیبنوعەباس

جوڵانەوە هەر چۆنێك بێت، لە ڕاوەستان باشترە!

شبلی شمەیل

هەندێك پیاو هەن هەر بەکلکی لە دایکبوون، گاڵتەجاڕییە ئەگەر بیانکەیتە سەرکردە!

هیتلەر

پیاوی بێ ژن، سەرێکی بێ لاشەیە، ژنی بێ پیاویش لاشەیەکی بێ سەرە!

پەندێکی ئەڵمانی

بەرامبەر بە پارە، خەڵکی هەموو دەبنە خاوەنی یەك ئایین!

ڤۆڵتێر

ئەگەر پەرداخەکە خۆی پاك نەبێت، هەرشتێکی تێبکەیت خراپ دەبێت!

هۆراس

# کارگێڕی بە چیرۆك



# لە جێی نەبووان

لــە کاتێکدا بەڕێوەبەر لە نێو کارگەدا دەهاتوو دەچوو، تەماشای کرد لاوێك پاڵی بــە دیوارێکــی کارگەکەوە داوەتــەوەو بۆ کرێکارەکان دەڕوانێت بێئەوەی هیچ کارێك ئەنجام بدات، لە لاوەکە نزیکبووەوەو پێی گوت: مووچەی مانگانەت چەندە؟

ئەویش بــە هێمنی وەڵامــی دایەوەو گوتــی: نزیکــەی (٢٠٠ دۆلارە)، بــەڵام لەبەرچیو بۆچی ئەم پرسیارە؟

بەڕێوەبــەر بێئــەوەی وەڵام بداتەوە، کیفی پارەکــەی دەرهێنــاو (٦٠٠) دۆلاری دایــە لاوەکــەو گوتی: من پــارە دەدەم بە خەڵکی تا لێرە کاربکەن، نەك ڕابووەستنو کەسانی تر سەرقاڵ بکەن!

ئەمە مووچەی سێ مانگو ئیتر لێرە نەتبینم!

کوڕە لاوەکــە پارەکــەی وەرگرتو بە خێرایی لە چاو ونبوو.

پاشــان بەڕێوەبەر بە دەنگێکی پڕ لە نارەزاییەوە ڕایگەیاند: ئەمە بەسەر هەموو تاکێکی کارگەکەدا جێبەجێ دەبێت.

دوای چەنــد خولەکێــك جەنابــی بەڕێوەبــەر لــە یەکێك لــە بەڕێوەبەری بەشــەکانی پرســی: کە ئاخۆ ئــەو لاوەی دەریکرد چ کارەیە؟

وەڵامەکە چــاوەڕوان نەکــراو بوو بۆ بەڕێزیان، چونکە بەڕێوەبەری بەش گوتی: قوربان ئەو لاوە کارمەنــدی ئێمە نەبوو، بەڵکو کارمەندی گەیاندنی پیتزایە!

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:

١- بەڕێوەبــردن: کارو چالاکــیو سەرپەرشتیو ئاراســتەکردنە، نەك تەنها ناوێکی بێ ناوەرۆك.

٢- بەڕێوەبەرێتی ئەرکو ماندووبوونو ڕۆڵــی بەرچــاوە، نــەك تەنها پۆســتێکی کارگێری.

٣- وەها بەڕێوەبەرێك هیچ ســوودێك بە دامەزراوەکەی ناگەیەنێت.

٤- نەناســینی کارمەندەکان لە لایەن بەڕێوەبــەردەوە، ئاماژەیە بــەوەی کە ئەو بەڕێوەبــەرە هیــچ پەیوەندییەکــی بــە دامەزراوەکەیەوە نییــەو بوونو نەبوونی چوون یەکە.

٥- کاتێك بەڕێوەبەر بەم شــێوەیە لە کارەکــەی دوور دەکەوێتەوە، زیانێکی زۆر بە بەرهەمو داهاتی وڵات دەگەیەنێت.

٦- بەڕێوەبەر دەبێت ئاگاداری ڕەوشی کار بێتو هەمیشــە بە هەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبــەری بەشــەکاندا پلانــی نوێ بۆ سەرخستنی کار دابڕێژێت.

٧- پێویستە بەڕێوەبەران بەیناو بەین دابەزنــە مەیدانی کارو لە نزیکەوە لەگەڵ ستافی کاردا بژین، تا لە نزیکەوە ئاگاداری کارو چالاکییەکانیان بن.





# سەرکردایەتی

ئا: هەڵگورد مەسعود شاکر

## دووەم/ ئەرکو مافەکانی سەرکردە:

* ئەرکە کەسییەکانی سەرکردە:

سەرکردەکان بەشێوەیەکی گشتی کۆمەڵێك ئەرکیان لەسەرە کە دەبێت پەیڕەوی بکەن لە کاتی سەرکردایەتیکردنیان لەهەر شوێنێك بن، جا ئەو شوێنە فەرمی بێت، یان نافەرمی، چونکە هەڵسوکەوتکردنی سەرکردە لەسەر بنەمای زانینی ئەرکە کەسییەکانی خۆی وا دەکات بەشێوەیەکی چالاکتر ئەو کاریگەریەی هەیەتی لەسەر شوێنکەوتووەکانی کاریگەریەکە تۆختر دەبێت، دیارە لێرەدا مەبەستمان لەو ئەرکە هاوبەشانە نییە کە پەیوەندی بە دەزگاکەوە هەیە، بەڵکو ئەو ئەرکانەی کە دەمانەوێت بیخەینەڕوو مەبەست لێی بۆ باشترکردنی کەسایەتی سەرکردەی کاریگەرە، مانەوەو درێژەدان بەسەرکردایەتی کردنەکەیەتی کە لەم چەند خاڵەی خوارەوە دەیخەینە ڕوو:

- خۆگونجاندن لەگەڵ گۆڕانکارییەکانی دەوروبەری کە هەندێکیان کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ڕێکخراو، هەندێکی تریشیان کاریگەرییەکەی ناڕاستەوخۆیە.

- ئازایەتی و خۆبەدەستەوەدانەدان لە دەرکردنی بڕیارو شێوازی نوێ، کە ئەمەش لە کۆتاییدا بۆ قازانجی ڕێکخراو دەگەڕێتەوە.

- دادپەروەری لە نێوان کارمەندەکان.

- پرسو ڕاوێژکردن بە فەرمانبەرە لێهاتووەکانی ناو دەزگاکە.

- بڵاوکردنەوەی ڕۆشنبیری گفتوگۆکردنو ڕێزگرتن لە ناو کارمەندەکان.

- چاککردنو پاککردنەوەی کەسە خراپەکان.

* مافەکانی سەرکردە:

چۆن سەرکردەکان دەبێت پابەندبن بە ئەرکە گشتیو تایبەتییەکانی دەزگاکان، یاخود ئەو ئامانجانەی کە شوێنکەوتووەکانیان هەیانە، کە بۆ ئەم مەبەستە چەندین مەرجیان هەیە تا ئەو کەسە دەکەن بەسەرکردەیان، ئاواش سەرکردە چەند مافێکی لەسەر شوێنکەوتووەکانی هەیە کە پێویستە ئەو مافانەی بە تەواوی بدرێتێ، وەکو:

- پێویستە فەرمانبەرو شوێنکەوتووەکانی گوێڕایەڵی بن.

- ستایشکردنو پاداشتکردنی سەرکردە لە لایەن ڕێکخراوەوە.

- پابەندبوون بە ڕاوبۆچوونەکانی.

- ئامۆژگاریکردنی سەرکردەو پێشنیارو بیروبۆچوونی ڕاست بە مەبەستێکی باش.

- پابەندبوون بەو ئەرك و کارانەی کە سەرکردە دیاریکردوون بۆ تاکەکان.

## سێیەم/ کێشەی لاوازی سەرکردەکان:

لەم باسەدا نیشانەکانی لاوازی دەسەڵاتو کەسایەتی سەرکردە باس دەکەین لەگەڵ هۆکاروچارەسەرەکانی لاوازی سەرکردایەتی، سەرەتا وەك بەرچاو ڕوونییەك پێناسەی لاوازی دەکەین، پاشان تەوەر تەوەر نیشانەو هۆکارو چارەسەری لاوازی سەرکردایەتی دەخەینە بەرباس.

لاوازی: بریتییە لە لاوازی کاریگەری بەرنامەو سیاسەتەکانی سەرکردە، لەسەر دەروونو هەڵسوکەوتی تاکەکان بۆ گەیشتن بە ئامانج.

* نیشانەکانی لاوازی سەرکردە:

- نەبوونی ڕێکخستنێکی تەواو لە ناو کۆمەڵەکەی.

- پارێزگاری نەکردنو پشتگیری نەکردنی هاوکارەکانی.

- لاوازی لە هەنگاونان بۆ گەیشتن بە ئامانجو کارو چالاکییەکانی ڕێکخراو.

- بوونی هەندێك خەسڵەتی نێگەتیف لە نێو هەندێك لە ئەندامەکانی کۆمەڵەکەی.

- گوێ نەگرتنی بۆ ڕای بەرامبەر.

هۆکارەکانی لاوازی سەرکردە:

- دەفگرتن لە یەك چوارچێوەی سەرکردایەتیکردندا.

- باوەڕ نەبوون بە هەندێك ئامانج.

- خۆشنەویستنی کارەکەیو شارەزانەبوون لێی.

- پەلەکردن لە دروستکردنی سەرکردەو پێدانی پۆستی سەرکردایەتی پێش ئامادەکردنی بە باشی.

-زۆربوونی هەڵەکانوچارەسەرنەکردنیان.

* چارەسەرەکانی لاوازی سەرکردە:

- گوێگرتن بۆ ڕای بەرامبەر.

- بڕیاردانی بە کۆمەڵ.

- دۆزینەوەی تاکی سەرکەوتوو و دڵسۆز.

- دروستکردنی ژینگەیەکی تەندروست، دوور لە ململانێو ترسو دڵەڕاوکێ.

- تێکەڵ بوون لەگەڵ کەسەکانو گوێگرتن لێیان.

- چاودێریکردنی تێچوونەکانو دانانی بودجەیەکی پێویست.

- بایەخدان بە خاڵی هاندانو بەخشینی دیاری بە فەرمانبەرەکان.

- پەروەردەکردنی نەوەی نوێ بۆ سەرکردایەتیکردن بە تەواوی.

د.محەممەد فەتحی

بەشی چوارەم و کۆتایی

# بەڕێوەبەرەکەت بناسە

و: گۆران جەمیل

**بەڕێوەبەری دووزمان:**
**کەسایەتی ئاوهایە:**

١-هەمیشە پەیامەکانی ئاڵۆزەو ڕوون نین.

٢- پێت دەڵێت: کە کارەکەت زۆر باش ئەنجامداوە، بەڵام جارێکی تر دێتەوەو سەبارەت بە هەمان کار ڕەخنەت لێدەگرێت.

٣- هەموو کات مەسەلەکانی دەتخاتە دڵەڕاوکێوە.

٤- هەڵسوکەوت کردن لە گەڵیدا بێ ئەنجامە، بۆچوونەکانی جێگیر نییە، لە سەر کارەکەت.

٥- سەرزەنشتی ئەو کەسانە دەکات کە لەگەڵیدا کار دەکەن، بەوەی کە بە پێی ڕێنماییەکانی ئەو کارناکەن.

**چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا:**

١- هەوڵبدە کە ڕاڤەی پەیامە ئاڵۆزەکانی بکەی کە بۆت دەنێرێت.

٢- لەسەر ئەو بنچینەیە هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکە کە کێشەکە پەیوەندی بە سیاسەتو لێپرسینەوەی کارەوە هەیە، نەك هەڵسەنگاندنی ئیزدواجیەت لەلایەن بەڕێوەبەرەوە.

٣- با هەمیشە بیانووت هەبێت بۆ ئەو شتانەی کە پێدەچێت ڕەخنەت لێ بگرێت، لە بیانووەکانتدا پێداگری بکە لە سەر ئەو شتانەی کە پێشتر پێی گوتوویت، سەبارەت بە شێوەی کار جێبەجێکردن، با قسەکردنت لەگەڵیدا نەرمو نیان بێت، بە بێئەوەی تۆمەت باری بکەیت بە کەسێکی دووڕوو.

٤- لەسەر خۆو نەرمونیان گوێی لێبگرە، تۆمەتی فرە بۆچوونی سەبارەت بە تۆ مەخەرە پاڵی، یان پێی مەڵێ هەڵسوکەوتکردنت لەگەڵمدا ناجێگیرە.

٥- پێشنیاری ئیجرائاتی بخەرە بەردەم کە گونجاو بێت لەگەڵ سیاسەتی کاردا، بۆئەوەی لێکۆڵینەوەو وتووێژ بکات لەگەڵتدا.

٦- بۆی دەرخە کە تۆ لە هەندێك ڕێنمایی تێناگەیت، بە بێئەوەی پێی بڵێیت کە بێ عەقڵە، یا بۆچوونەکانی دوو لایەنەیە.

٧- با پرسیارەکانت ڕاستەوخۆو سنوردار بێت، پێشنیارەکانت با گونجاو و شایەنی جێبەجێکردن بێت.

٨-هەرگیز سەرزەنشتی بەڕێوەبەرەکەت مەکە، بەڵکو سەرزەنشتی سیاسەتو ڕێنماییەکان بکە.

**بەڕێوەبەری ڕاڕا:**
**کەسایەتی ئاوهایە:**

١- لە قسەی خۆی پەشیمان دەبێتەوە لەبەرئەوەی هەست بە دڵنیایی ناکات.

٢- لە بڕیاردان دەترسێت، یان لە ئەنجامەکەی بە گومانە.

٣- توانای بڕیاردانی نییە.

٤- بڕوای بە خۆی نییەو هەست بە کەمی دەکات، یان هەست بە بوونی کەموکوڕی دەکات لە شێوازی بەڕێوەبردنیدا.

٥- گومانی هەمیشەیی هەیە، لە هیچ شتێك دڵنیا نییە.

**چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا:**

١- با لێرەدا ئامانجت ئەوە بێت کە وا لە بەڕێوەبەرەکەت بکەیت کە بتوانێت بڕیار بدات لە سەر ئەو مەسەلانەی کە بە هەڵواسراوی ماوەتەوە.

٢- هەروەها ڕای بهێنیت لە سەر دوورکەوتنەوە لە ڕاڕایی.

٣- دەتوانیت ڕۆڵ بگێڕیت بەوەی کە هەستی بە کۆکردنەوەی زانیارییەکانو شیکردنەوەو کورتکردنەوەیو پێشکەشکردنی بە بەڕێوەبەرەکەت، ئەمە وا دەکات کە کەمتر ڕاڕا بێت لە بڕیارەکانیدا.

٣- ئەگەر مەسەلەکە پەیوەندی بە دەرەوەی سنوری کارەکەتەوە هەبوو، یان کاریگەری هەبوو لە سەر پەیوەندی بەڕێوەبەرەکەتو بەرپرسانی لە خۆی گەورەتر، یان هاوڕێکانی، هەرگیز نەکەی بەشداری بکەیت، مەگەر بۆ خۆی داوای زانیارییەکی دیاریکراوت لێ بکات.

٤- ئەگەر دەتەوێت بەڕێوەبەرەکەت دوورکەوێتەوە لە ڕاڕاییو یارمەتی بدەیت لە بڕیاردانیدا، دەبێت بە شێوەیەك بێت وا هەست نەکەی کە دەسەڵاتی بەڕێوەبەر گواستراوەتەوە بۆ تۆ، تۆ بوویتە بەڕێوەبەری نافەرمی، ئەمە وا دەکات کە بەڕێوەبەرەکەت بە گومان بێ لێتو لە کورسییەکەی خۆی بترسێت.

وریابە با بەڕێوەبەرەکەت هەرگیز وا هەست نەکات کە ناتوانێت هیچ بڕیارێك دەربکات بە بێ تۆ، چونکە ئەمە لە کەسایەتی کەم دەکاتەوەو بە هیچ شێوەیەك پێی ڕازی نابێت.

٦- هەمیشە با هەڵسوکەوتت وا بێت کە تۆ کارمەندو ئەو بەڕێوەبەر بێت، بە وریاییەوە ڕۆڵی خۆت ببینە، ئەو زانیاریانەی کە بەڕێوەبەر پێویستییەتی، پێشکەشی بکە بە وردیو ڕاستگۆیانە.

٧- نەکەی تۆش ڕاڕا بیت لە بڕیاردانیدا، یاخود لە بەرامبەر ڕاڕایی بەڕێوەبەرەکەتدا تۆش ڕاڕا بیت وەکو ئەو، چونکە ئەمە وا دەکات کە کەموکوڕی لە کارەکانتدا دەرکەوێتو زۆرجار تۆمەت بار بکرێیت بەوەی کە بە باشی کارەکانت ئەنجام نادەیت.

**بەڕێوەبەری هەڵسوکەوت سارد:**

کەسایەتی ئاوهایە:

١- حەزی بە تێکەڵاوی کردن نییەو هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا ساردوسڕە.

٢- لەبەر کەم تێکەڵاویی کردنی لەگەڵ خەڵکیدا، وەك کەسێکی خۆ بە زلزان دەردەکەوێت.

٣- لەبەرئەوەی شارەزایی نییە لە هەڵسوکەتکردن، کاتێك کە تێکەڵاویی خەڵکی دەبێت سوکایەتی بە خەڵکی دەکات.

٤- هیچ بایەخ بە بیروڕا گۆڕینەوە نادات لەگەڵ کەسانی ترداو هەمیشە بیرەکانی خۆی لاپەسەندە.

٥- بە هۆی هەڵسوکەوتە ساردەکانییەوە هەر وەك چیایەك لە بەفر وایە هێندە ساردوسڕە.

٦- ناتوانێت بزانێت هەستەکانی بەرامبەر بە شتەکان چییە، ئەمەش بە هۆی زۆر خەفەکردنی هەستەکانییەوە.

٧- بە هۆی بێدەنگییەکەیەوە بەرامبەر دەکوژێت.

٨- هێندە بۆ خۆی دەژی، هەرگیز حەز ناکات کەس بێزاری بکات.

**چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەمجۆرە بەڕێوەبەرانەدا:**

١- هەوڵبدە کە بەڕێوەبەرەکەت وا هەست بکات کە تۆ هەمیشە لەگەڵیدایت، ئەمەش لە ڕێگای کەمکردنەوەی بەربەستەکانی سەر ڕێگاو کەمکردنەوەی تێچوونەکانو زیادکردنی دەسکەوتەکانەوە، هەمیشە هەواڵی سەرکەوتنەکانی کارەکەی پێ ڕابگەیەنە، بە جدیو ڕوونی کارەکانت ڕاپەڕێنە، کات بدۆزەوە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵیدا.

٢- لە دەروونی خۆتدا گفتوگۆی ئەوە بکە کە چۆن بتوانیت بەربەستەکانی سەر ڕێگای بەڕێوەبەرەکەت لابەریت.

٣- کاتێك باسی کێشەیەکی بۆ دەکەیت هەوڵ بدە بە کورتی بۆی باس بکەیت، زانیارییەکان بە وردیو بە پەلە بۆی بگێڕەوە، کە ئەمە یارمەتیدەری دەبێت بۆ بڕیاردانی، مەسەلەکان بە وردی بە پەیوەست بکە بە یەکەوەو پاشان پێشکەشی بکە.

٤- لە کارەکەتدا هەرچی فەرمانێکی پێکردی بۆی جێبەجێ بکە، ئەمە بۆئەوەی کە بێت بۆ لای تۆ کاتێك کە کارێکی ویست.

٥- بە دوای هەلدا بگەڕێ بۆئەوەی بتوانیت زیاتر متمانەی ئەو بە دەست بهێنیتو دیواری بەستەڵەکی نێوانتان بشکێنیت، ئەمەش لە ڕێگای بە دەستهێنانی متمانەوە دەبێت، چونکە ساردوسڕی هێندەی تر بەربەستەکانی نێوانتان زیاتر دەکات.

**بەڕێوەبەری باش:**

کەسایەتی ئاوهایە:

١- لە کارەکەیدا جدییە، بەڵام دڵی زۆر باشە.

٢- هەرچی پێ بڵێت بڕوات پێ دەکاتو کەسێکی سادەیە.

٣- کەسایەتییەکی زۆر لاوازی هەیە، بە ئاسانی کاری تێ دەکرێتو دەتوانرێت بۆچوونەکانی بگۆڕدرێت.

٤- لە و بڕوایەدا نییە کە لە دونیادا خراپەو درۆو خیانەت هەبێت.

٥- پێی خۆش نییە کە فەرمان بە سەر کارمەندەکانیدا بکاتو کێشەکانیان بۆ چارەسەر بکات.

٦- توانای چارەسەرکردنی کێشەکانی نێوان کارمەندەکانی نییە، یان تێبینی هەڵەکانیان ناکات.

**چۆنێتی هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەمجۆرە بەڕێوەبەرانەدا:**

١- هەوڵبدە کە کارەکانت بە باشترین شێوە ڕاپەڕێنیت، هەموو هەوڵێکت بەگەڕبخە.

٢- تەماشای کارەکەت بکە بزانە بە باشی ڕایدەپەڕێنیو بە پێی ئەو پێوەرەیە کە داوات لێکراوە.

٣- ئەگەر پێویستت بە زانیارییەك هەبوو، لە لای بەڕێوەبەرەکەت دەست نەکەوت، ئەوە بڕۆ بۆ لای کەسێکی شارەزا لەو بوارەدا، نابێت بەڕێوەبەرەکەت ئیحراج بکەیت، یان پیشان بدەیت کە کەسێکی لاوازە.

٤- ئەگەر زانیت کە هەوڵەکانت لە لایەن بەڕێوەبەرەکەتەوە پێی نازانرێت، ئەوە بڕۆ بۆ لایو بە ئەدەبەوە پێی بڵێ، مەسەلەکەی بۆ ڕوون بکەرەوەو بە بەڵگەوە قسەی بۆ بکە، زیادەڕەوی مەکە، وا خۆت پیشان مەدە کە تۆ باشترین کەسی کارەکەی.

٥- نەکەی دەست لە ڕاستگۆییو دڵسۆزی هەڵگریت، تەنانەت ئەگەر چواردەورەکەشت بە هۆی کەمتەرخەمی بەڕێوەربەرەکەتەوە تووشی بێتاقەتیو بێزاری ببن.







ئا: محەممەد مەولود

# دوای 34 بڕیار ئایا بڕیارت هەیە؟!!

ڕەنگە ناونیشانی بابەتەکە لای تۆی خوێنەری بەڕێز کەمێک سەیر بێت، بەڵێ هەر بەو جۆرەیە لە کاتێکدا لە بیری نووسینی بابەتێکدا بووم هەوڵمدا ئەو بابەتەی پێشکەشی ئێوەی ئازیزی دەکەم لە واقیعو ڕەفتاری خۆمدا تارادەیەك بەرجەستە بووبێت، یان هەوڵی پراکتیزە کردنیم دابێت، هەر بۆیە هەڵوێستەیەکم کردو تەنها ئەم دێڕەم لە خۆم پرسی (دوای ٣٤ بڕیار ئایا بڕیارت هەیە؟!!)

پاش دەستخۆشییەکی بێسنوور لە ستافی ئەم گۆڤارەو هیوای بەردەوامی بۆیان، دەبینرێت گۆڤاری بڕیار کە تائێستا ٣٤ ژمارەی پێشکەش بە خوێنەرانی کردووە، تا ڕادەیەکی بەرچاو ڕەهەندو شێوازەکانی گەیاندنی گرتووەتەبەر لە بواری کارگێڕی کارو بەڕێوەبردنی خودو پەروەردەیەکی تەندروستو بازارسازیو... هتد، دیارە ئەرکی ئەم گۆڤارە ئاراستەکردنی خوێنەرە بەرەو باشیو سەرکەوتن لە تەواوی کایەکاندا بە زمانێکی شیاوو سەرنجڕاکێش، هەر لە زمانی ئایدیاو ئامۆژگاریو چیرۆکو زمانی منداڵو تەواوی شێوازە زیندووەکانی سەردەم.

ئەوەی مەبەستی منە لەم بابەتەدا ئەوەیە ئەرکو کاری ئەم گۆڤارە خستنە ڕووی زانیاریو چۆنییەتی هەنگاونانە لە واقیعێکی نەویستراو و ناتەندروستەوە بەرەو داهاتوویەکی پڕۆگرامدارو فێربوونی هونەری بڕیاردان، گێڕانەوەی ئەزموونی پڕ وانەی گەورە پیاوانو سەرکەوتووانی مێژووو... شرۆڤەکردنی هەڵە کلتووریو هەڵپەسێرراوەکانو دەستنیشانکردنی ڕێگە چارەی لۆژیکیانە بۆیان، بڕیار ڕۆڵی ڕۆشنایی نێو تاریکییەکانی ژیانو پاسۆردی دەرگا داخراوەکانو دانانی یەکەم خشتی خانووە دارووخاوەکان دەبینێت، لێرەدا گرنگتر لەوەی وتراو خوێنرایەوە ئەمەیە:

پاش ئەوەی توانیمان ئەرکو کاری بڕیار دیاری بکەین، دەی ئایا دەبێت ئێمەی خوێنەری بڕیار چ کارە بینو ئەرکو ڕۆڵی ئێمە لەم نێوەندەدا چی بێت؟!! ئایا تائێستا لە خۆت پرسیووە بۆچی بڕیار دەخوێنمەوە؟ چ سوودێکم لێ وەرگرتووە؟ ئایا تەنها ببکەمە دۆستی بێدەنگی بستە خواردنی شەوانو هیچ هەڵوێستەیەك نەکەم لەسەر پەڕەو پەندو بابەتەکانی؟ ئایا توانیوتە یەکێك لە بابەت، یان دێڕەکانی دووبارە بخوێنیتەوە بە مەبەستی سوود وەرگرتنی باشتر؟!!

با لەم دێڕەوە دەست پێبکەین (الإرادة هي جوهر الإدارة)، دۆستە بەڕێزو خۆشەویستەکانم مرۆڤ کاتێك دێتە دنیاوە خاوەن متمانەیەکی بەهێزە بە خودی خۆی لەو ژینگەیەی کە تێیدایە، هەر بۆیە کاتێك منداڵ دەگاتە سەرەتای کاتی قسەکردنو ڕۆیشتن بوێرانە بۆ زۆر جێگە دەچێتو زۆرکار ئەنجام دەدات کە ڕەنگە جێگەی مەترسی بێت بۆی، هەر بۆیە ئاگادارییان دەبین لەو کارانەو هەندێجار ناهێڵین لە کۆمەڵە کارو ڕەفتارێك نزیك ببنەوە بە پاساوی هەبوونی مەترسی بۆیان، قسەی ئێمە ئەوە نییە بێ ئاگا بین لە پەروەردەو هەڵسوکەوتی منداڵ، یان ڕێخۆشکەربین بۆ سەرەتایەك لە سەرکەشیو سەرەڕۆیی، بەڵکو مەبەست لەوەیە ئەو ڕەوشتە جوانەی کە لە بنەڕەتدا لە سروشتی منداڵدا بوونی هەیە سەرکوت نەکەینو یارمەتی دەریان بین هەر لە سەرەتای پێگەیشتنیانەوە هەستی باوەڕ بەخۆبوون درك پێ بکەن، تا داهاتوویەکی داهێنەر بۆ خۆیان مسۆگەر بکەن، نەك شوێنکەوتەیەکی ڕۆتینی ئەودیو داهێنانەکانی سەردەم بن، بە واتایەکی تر لە منداڵیدا سەرکوتکردنیان دەبێتە هۆی مراندنی متمانەبوون بە خۆیان، چونکە برەوپێدانی ئەو بەهرەیە کە لە پێشینەدا خۆی بوونی هەبووە ئاسانترە لە سەر لە نوێ گیان بە بەردا کردنەوەو زیندووکردنەوەی، لە کاتێکدا فاکتەری لە ناوبردنی ئەو بەهرەیە هەر خودی خۆمانین، بۆیە بەڕاستی کارو ڕۆڵی ئەم گۆڤارە تەنها ڕێ ڕۆشنییەو ڕۆڵی دواتر کە ئەرکی ئێمەی خوێنەرییەتی متمانەو باوەڕ بەخۆبوونە، کە ئەم متمانە بەخۆبوونەش وا دەکات مانشێتو گوفتارو قسە نەستەقەکان ببنە ڕەفتارو

هەڵسووکەوتو بچنە مەیدانی پراکتیکیو کردارییەوە دواتریش ببنە سروشتی مرۆڤە سەرکەوتووەکان، واتە هەموو کات گوفتار پێش ڕەفتار دەبێت، بەڵام ئەوەی ئەم دووانە پێکەوە گرێ دەدات تەنها متمانە بەخۆبوونە، مرۆڤی خاوەن گوفتاری بێ کردار زۆرینەی کات لە دەربڕینەکانیدا وەك پێویست مەبەستەکانی ناپێکێتو بە پێچەوانەشەوە مرۆڤی خاوەن کردار قسەو ئامۆژگارییەکانی کاریگەری تەواوی لەسەر گوێگر هەیە، بەڵێ کاتێك مرۆڤ بە کردارو ڕەفتارەکانی پێناسەی سەرکەوتن بۆ منو تۆ بکات، کاتێك بە ئەزموونو جێ دەستەکانی لە کایە جۆر بە جۆرەکاندا فەلسەفەی بوونو بریارنامەیەك بە منو تۆی خۆشەویست بناسێنێت.. بە دڵنیاییەوە ئەگەر تەنیا وشەیەکیش نەڵێت ناوەڕۆکی ماستەرنامەیەك دەخاتە ڕوو بەراورد بە کەسایەتی پێشوو، وتە پیرۆزەکەی خوداش لەم ڕاستیە باش ئاگادارمان دەکاتەوە (یاأیها الذین آمنوا لم تقولون مالا تفعلون)، ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك دەڵێنو ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟

کەواتە زانرا مرۆڤی خاوەن بڕیار یەکێك لە پرەنسیپەکانی بریتییە لە متمانەبوون بە خود، ئەگەر دۆستایەتیمان لەگەڵ تەواوی ژمارەکانی بڕیاردا تاهەنووکەش بەردەوام بێت بەڵام پەیوەندییەکی زیندوی پۆزەتیڤی لەگەڵ کەسایەتیو ژینگەی بوونماندا نەبێت جگە لەوەی ٢٥٠٠ دینارمان زیانکردووە ئەوەشی زانیومانە کۆمەڵە داتایەکی وەلانراوی نێو هەگبەی بیرمان نەبێت چیتر نین.

کۆتا برگەی بابەتەکە بە چیرۆکی یەکێك لە دۆستانم تەواو دەکەین، چیرۆکێکی سەرنجڕاکێشی پەند ئامێز کە خۆی بەمجۆرە بۆی گێڕامەوە:

(سەرەتای بیرکردنەوەم بوو لە ئەنجامدانی کارێك کە بەدەر نەبوو لە توانای مرۆڤەکان، لە ڕاستیدا کارێکی ئاسان نەبوو، بەڵکو بازرگانییەکی سەیربوو بۆ من، چونکە دەسپێکی خودی مامەڵەکە بری ( ٢٠٠٠٠$ )ی پێویست بوو، ئەمە لە کاتێکدا من خاوەنی تەنها ( ١٠٠$ ) یش نەبووم، موجازەفەیەکی سەیرە؟؟نا؟! کەوتمە ڕاوێژ بە دۆستە دڵسۆزو هاوپیشە بەڕێزەکانم بۆ ماوەی (٢مانگ) بەداخەوە کۆمەڵێك قسەو بۆچوونی ڕووخێنەرو ڕەشبینییەکی تەواو نەبێت هیچی ترم دەست نەکەوت، بگرە هەندێکیان بە کەسێکی خەیاڵاویو مرۆڤی جیهانی خەونە هەرگیز نەهاتووەدییەکانیان دەزانیم، تەنانەت لاتان سەیرنەبێت قسەی نزیکترین کەس کە باوکم بوو، ئەوە بوو هەمیشە دەیوت: (کوڕم دانیشە بە دەردی خۆتەوە، تۆ سواری گای هاردەبیت)! بەڵام پێمخۆشە ئێوەش بۆچوونی هاوشێوەتان نەبێت، چونکە تەواوی هەنگاوەکانی ئەم کارە تازەیەم هەڵسەنگاندبوو بە توانای خۆمو پێشبینی قازانجو زیانەکانیم کردبوو، ئەوەی بەر لە هەر شتێك پێویستم بوو تەنها متمانە بە خۆبوون بوو بەڵێ ئیرادەو هیچی تر، پاش ماندووبوونێکی زۆر لە ڕاوێژکردنو دوودڵیو ڕاڕاییەکی بەردەوام دوای (٢مانگ) لە یەکێك لە نوێژە بە کۆمەڵەکاندا بیرم دێت ڕکاتی دووەمی نوێژی مەغریب بوو لێتان ناشارمەوە من لە نێو خەیاڵاتو بیری ئەم بازرگانییە دێوەزمەیەدا بووم، ئەوەی ئەمجارە ئەندێشەی خەیاڵی پچڕاندم، قسە بێئومێدەکانی پێشوو نەبوو، بەڵکو دەنگی بەرزی پێشەوای مزگەوتەکە بوو کە فەرمووی: (... وایاك نستعین...) تەنها پشت بە تۆ دەبەستین تەنها تۆی کۆمەکو یارمەتیدەرو پشتیوانمان، بڕوا بکەن تەواوی گیانم کەوتە لەرزین، ئەو کاتە باش تێگەشتم لە مانای ئەو ئایەتە پیرۆزە، بەڵێ دۆستە بەڕێزەکانی بڕیار سوپاس بۆ خوا ئەوە یەکەم هەنگاو و دەستپێکردنی بازرگانییەکەم بوو توانیم لە ماوەیەکی کەمدا لە کایەکەی خۆمدا ببمە یەکێك لە ڕکابەرەکان، دەزانن ئەو دۆستانەی تەنها ئەگەرە خراپەکانیان بیر دەهێنامەوە ئێستا قسەیان چییە؟ تەنها بێدەنگی!!)

لە کۆتاییدا بۆ ئەوەی قسەکان بکەینە کردار، تکایە با متمانەبوون بە خود بدۆزینەوە، بەڵام بیرمان نەچێت ئەمیش هەڵهێنجراوی متمانەبوونە بە خوا، بە ئومێدی سەرفرازی.

سپێدە هۆرمزیار



# زانین... یان بەرنامەڕێژی

دەڵێن خۆشی ساتەکان لەوەدایە کە نازانین دوای ساتێکی تر چی ڕوودەدات.

بەڵام بە پێچەوانەوە کەسانێك ئارەزوو دەکەن کە بزانن بەیانی، یان دوو بەیانی ئەو گۆڕانکارییانە چین کە لە ژیانیاندا ڕوودەدات، بە گشتی ئەمە حەزی هەموو لایەکە، بەڵام ئێوە پێتان وانییە کە دەربارەی داهاتوو هیچ نەزانین باشترە؟

هەڵبەتە ئەگەر بزانن کەی دەمرن خۆتان دەپارێزن لە کردنی هەر تاوانێك، چێژی تەوبەو خۆ زەلیلکردن ناکەن، بەو جۆرەش چاوەڕێکردنی مردن لە مردن ناخۆشترە، ئەمە تەنها نموونەیەك بوو کە پەیوەندیدارە بە تەواوی لە لایەنەکانی ژیانتان بۆ خۆ سەرقاڵکردن بە کەلوەکانو جادوگەریو زانینی ئەوەی لە داهاتوودا چی ڕوودەدات، کارێکی بێ بەهایە لە بری ئەوەی بزانن لە داهاتوو چی ڕوودەدات، بەرنامەڕێژی بکەن بۆ باشتر بوونی داهاتووتان، تا هاوسەنگی بپارێزن لە نێوان دوارۆژو دونیادا.



# گوفتار کرۆکی کردار

ئەسکەندەر ڕەحیم

وشەو وتەکانمان، چۆن کار لە کاروبارەکانمان دەکەن؟ وشەو وتەکان، ڕێنوێنی هێزو وزەکان دەکەن.. تا ببن بە ڕەفتارو کردار.

د. ڕۆبێرت ڕیگان دەڵێت: پاش سێ دەیە لە کارکردن لە بواری پزیشکی دەروونیو ڕاهێنانی گەورەکاندا، ئەوە فێر بووم کە بە باشی گوێ بۆ هەرکەسێك لەوانەی بە مەبەستی داواکردنی ئامۆژگاریو ڕێپیشاندان دێنە لام، ڕابگرم. من لە وشەکانی دەتۆژمەوە، لە سەرنجەکانی دەکۆڵمەوە، تا وەڵامی دوو پرسیاری دیاریکراوم دەست بکەوێت، ئەوانیش:

* بە وردی چی دەوێت؟

* بە هۆی پەیوەندییەکانییەوە، چۆن لەمپەر دەهێنێتە سەر ڕێی خۆی؟ چۆن وشەو وتەکانی بەربەست لە نێوان خۆیو بەدیهێنانی ئامانجەکانیدا دروست دەکەن؟

ئێمە بە ئاخاوتنو وشەو وتەکانمان، هەوڵی داواکردنی ئەوەی دەمانەوێت، دەدەین، بەڵام هەر بە هەڵبژاردنو دیاریکردنی شێوازی ئاخاوتنمان، شێوازی بەدەستهێنانی خواستەکانمان هەڵدەبژێرینو دیاری دەکەین، بۆیە وشەو وتەکانمان، هەمیشە گوزارش لە شێوازی کارکردنو جێبەجێکردنمان دەکەن.. زەمانحاڵی نەزانینیشمانە سەبارەت بەو ڕێگەچارانەی دیکە، کە هەن. وشەو وتەکانمان ڕەنگدانەوەی بۆچوونو ئامادەسازییەکانی خۆمانن. هەر چییەکیش لە هزرو هۆشماندا نەبێت، لە وشەو وتەکانیشماندا نابێتو ئیدی بە هەندی وەرناگرین، چونکە وشەو وتەکان خۆیان ئامادەسازیو زەمینەسازی بۆ ئەو کارانەی دەمانەوێت ئەنجامیان بدەین، دەکەن.

لە ڕووی زانستیشەوە سەلمێنراوە:

ئەو کەسەی دادی حاڵی خۆی لە دەست برسێتی دەردەبڕێت، بە بەراورد لەگەڵ ئەو کەسەی باسی برسێتی خۆی ناکاتو خۆی دەگرێت، زۆرتر دەخوات.

ئەوەشی هەڕەشەی بەکارهێنانی توندوتیژی دەکات، لەو کەسەی بێزاری خۆی بەرامبەر توندوتیژی دەردەبڕێت، زۆرتر پەنا دەباتە بەر زەبروزەنگو توندوتیژی.

ئەوانەش کە سەبارەت بە ئاسودەییو بەختەوەری، زۆر دەدوێن، لەو کەسانەی سەبارەت بە مەینەتیو بەدبەختی دەدوێن، زۆر دڵخۆشو کەیفسازترن.

وشەو وتەکان کاریگەرییان لەسەر ئەو کەسەی دەیانڵێت بەهێزترو زۆرترە، لە چاو ئەو کەسەی دەیانبیستێت.

وشەو وتەکان پێش کارو کردارەکان دەکەون، کە گوزارش لە ئامادەسازییە دەروونییەکان دەکەنو ئەو سەرپشکییانەشی کەسەکە دەیانکات بە تەوەرو گرێژنەی شێوازی بیرکردنەوەی، دیاری دەکەن. دەیسا ئەگەر توانیمان وشەو وتەکانمان بگۆڕین، ئەوا بە ڕاستی کردارەکانی خۆمانی پێ دەگۆڕدرێن.. چونکە گۆڕانکاری بە وشەو وتەکان دەست پێ دەکاتو بە کارو کردار کۆتایی دێت.

هەر چەندە مرۆڤ پێ بگات، ئەوەندە زۆرتر پەی بە وشەو وتەکانو کاریگەرییان دەباتو وای لێهاتووە زۆرتر پێداگرو وردەکار بن. زانراویشە ئەو بە گوفتار بڕی دەکەین لەسەر خۆمان.. هانمان دەدات، تا بە کردار پێی ئەمەکدار بین. هێلکەدز هەر بە هاندانی دەوروبەری دەبێت بە گادز. جەنگی نێوان دوو وڵات، سەرەتا بە شەڕەقسە دەست پێ دەکات، پاشان دەبێت بە شەڕەتەقە. کاتێکیش باسی لیمۆی ترشو مزرو خۆشمان، بۆ دەکرێت، دەممان ئاوی تێدەزێتو لافاوی لیکمان هەڵدەستێت.

سەرکردەش لە ڕێگەی بارگاویکردنی پەیڕەوانی، بە وشەو وتەکانی، لەسەر دەسکەوت هەڵیان دەنێت. هەمیشە سەرکردە، بەر لەوەی بڵێین: «کارەکانی ڕاییە» بە «بە قسەڕۆیشتوو» دەیناسێنین، چونکە سەرکردە بە توانای ڤایلکردنو دڵدامەزراندن جیا دەکرێتەوە، نەك بە ناچارکردنی پەیڕەوانی لەسەر بوون بە کۆیلەی گوێ لە مست.

هەموو مرۆڤێکش دوو شێوە زمانو ئاخاوتنی هەیە. ئێمە وشەو وتەکان لەو وتووێژانەی لەگەڵ خۆمانو لەگەڵ کەسانی دیکەدا، ئەنجامیان دەدەین، بە کاردەهێنین.

لە ساتەکانی تەنیاییو دوورەپەرێزیمان لە کەسانی دیکە، لەگەڵ خۆماندا بیر لەو شتانەی دەمانەوێت، دەکەینەوەو سەرپەرشتیی وتووێژێکی تایبەتی دەکەینو لە خۆمان دەپرسین: چیمان دەوێت؟

ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە هەر یەکەمان دوو جۆر زمانی ئاخاوتنمان هەیە:

١- زمانێك کە لەگەڵ کەسانی دیکەدا پێی دەدوێینو بە زمانی دەرەکی دەناسرێت.

٢- زمانێك کە لەگەڵ خۆماندا پێی دەدوێینو بە زمانی ناوخۆیی دەناسرێت. کەواتە ئەرکی سەرشانمانە فێری چۆنییەتی ئاخاوتن ببین، تا ڕێنوێنی خۆمانو کەسانی دیکەشمان پێ بکرێت.




# جیاوازی نێوان فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی

بەرزان ئەبوبەکر

لە ژمارەکانی ڕابردووی بڕیاردا بابەتێکمان سەبارەت بە جیاوازی نێوان بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتیو بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی بڵاوکردەوە، زۆرێك لە بەڕێوەبەران وا هەستیان کرد مەبەست لە بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتی ئەو کەسەیە کە خەڵکی وڵاتانی ڕۆژئاوا بێت، بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتیش هەموو ئەو کەسانە دەگرێتەوە کە خەڵکی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتن، هەر بۆیە بە باشمانزانی لە بڕیاری ئەمجارەدا ئەو بیرۆکەیە ڕاست بکەینەوەو بڵێین: بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی ئەو کەسانە نین کە دانیشتووی وڵاتانی ڕۆژئاوان، هەروەها بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتیش ئەو کەسانە نین کە دانیشتووی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتن، بەڵکو مەبەست لە بەڕێوەبەری ڕۆژئاوایی ئەو کەسەیە کە خاوەنی ئەو سیفەتە جوانانەیە کە باسکراون، ئیدی دانیشتووی هەر کلۆجێکی ئەم گێتییەیت، بە هەر زمانێك قسە دەکەیت، ئەگەر هەموو ئەو سیفەتە جوانانەت هەیە کە بەناوی بەڕێوەبەری ڕۆژئاواییەوە بڵاوکراوەتەوە، ئەوا تۆ بەڕێوەبەرێکی ڕۆژئاواییت، بە پێچەوانەشەوە ئەگەر دانیشتووی قوڵایی وڵاتی ژاپۆن، یا ئەوروپا، یا ئەمریکا بیت، ئەگەر هەڵگری ئەو سیفەتانەیت کە لە بەڕێوەبەری ڕۆژهەڵاتیدا هەیە، ئەوا بەڕێوەبەرێکی ڕۆژهەڵاتیت، تەنها بە گۆڕینی سیفەتە خراپەکانت دەبیتە بەڕێوەبەرێکی ڕۆژئاوایی، نەك بە گۆڕینی شوێنی نیشتەجێبوونت.

لە لایەکی دیکەشەوە بۆئەوەی تەنها قسە لەسەر بەڕێوەبەر نەکەین، ئەمجارەیان کەمێك جیاوازی فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتیو فەرمانبەری ڕۆژئاوایی دەخەینە ڕوو، چونکە ناکرێت فەرمانبەر بیەوێت بەڕێوەبەرەکەی ڕۆژئاوایی بێت، بەڵام خۆی فەرمانبەرێکی ڕۆژهەڵاتی بێت، هەروەك چۆن حەز دەکەیت بەڕێوەبەرەکەت کەسێکی ڕۆژئاوایی بێت، واتە خاوەنی هەموو سیفەتە جوانەکانی بەڕێوەبردن بێت، هەرواش پێویستە حەز بکەیت کە خۆشت فەرمانبەرێکی ڕۆژئاوایی بیت. ئەم خاڵانەی خوارەوە چەند جیاوازییەکی کەمن لە نێوان فەرمانبەری ڕۆژئاواییو فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی:

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: بۆ هەر ڕۆژێکی نوێ پلانو نەخشەی تایبەتی هەیە.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: بۆ هیچ کات لە ڕۆژەکانی ژیانی نەخشەو پلان دانانێت، تەنانەت ڕقیشی لە نەخشەو پلانە.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: کاتەکانی زۆر بە وردیو بە گوێرەی نەخشەو پلانی ڕۆژانەی بەسەردەبات.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: کاتەکانی بەشێوەیەکی هەڕەمەکیو بە بێ پلان بەسەر دەبات.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: لە کاتی دیاریکراودا لەسەر کارەکەی ئامادە دەبێتو دواناکەوێت، ئەگەر کەمێکیش لە کاتی دیاریکراو دواکەوت، پۆزش بۆ بەڕێوەبەرەکەی دەهێنێتەوە.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: هەمیشە حەزدەکات چەند خولەکێك، یان کاتژمێرێك دوای کاتی دیاریکراو بچێتە سەر کارەکەی، لەگەڵ ئەوەشدا ئامادە نییە پۆزش بۆ بەڕێوەبەرەکەی بهێنێتەوە.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: بۆ کاری زۆر پێویست نەبێت داوای مۆڵەت ناکات.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: بۆ هەر کارێکی ئاساییو تایبەتی خۆی داوای مۆڵەت دەکات. (ڕەنگە زۆرجار کەسە نزیکەکانی خۆی بمرێنێت لە پێناوی وەرگرتنی یەك دوو ڕۆژ مۆڵەت).

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: هەمیشە هەوڵ دەدات بەرهەمی زیاتر بە دەست بهێنێت لە کارەکەیدا، بە مانایەکی دیکە دەزانێت کە دەبێت لە بەرامبەر مووچەکەیدا کارو چالاکی ئەنجام بدات، کات بە ڕێ ناکات، بەڵکو لە ناو کاتدا کار دەکات.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: تەنها کات بەسەر دەبات و گوێ ناداتە بەرهەم، ڕۆژانە چەندین جار سەیری کاتژمێرەکەی دەستی، یاخود دیوارەکە دەکاتك تا بزانن کەی کاتی دەوام کۆتایی پێ دێت.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: ڕێز لە یاساو ڕێساو بنەمای دامەزراوەکەی دەگرێت، چۆن حەز دەکات لەسەر کارە چاکەکانی ڕێزو سوپاسی ئاراستە بکرێت، هەرواش حەز دەکات لەسەر هەڵەکانی سەرزەنشتو ڕێنمایی بکرێت.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: یاساکانی دامەزراوەکەی پێشێل دەکاتو هەمیشە حەز دەکات بۆ کارە ئاساییەکانی ڕێزو سوپاسی ئاراستە بکرێت، بەڵام ڕازی نابێت لەسەر هەڵەکانی سەرزەنشت بکرێت.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: هەست بە بەرپرسیارێتی دەکاتو هەمیشە دەیەوێت ویژدانی ئاسوودە بکات، هەر بۆیە حەز دەکات ڕۆژانە جێ دەستی دیاربێتو بەرهەمی باشترو نایابتر دەستبخات.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: هەستی بەرپرسیارییەتی لە ناخیدا یەکجار لاوازە، وا هەست دەکات کە تەنها لە دامەزراوەکەیدا بوونی هەبێت بەسە، ئیدی گرنگی بە بەرهەمی نادات.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: هەموو کات لە بیری ئەوەدایە کە چۆن خزمەتێکی نوێ پێشکەش بە گەلو نیشتمانەی بکات.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: هەموو کات بیر لە زیادبوونی مووچەکەی دەکاتەوە، بەردەوام خەون بە مووچەی بەرزی ئەو هاوڕێیانەیەوە دەبینێت کە خزمەتی ساڵانەیان لە ئەو زیاترە.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: لە کاتی دەوامی فەرمیدا خۆی بە کاروباری لاوەکیو تایبەتی خۆیەوە سەرقاڵ ناکات، لەگەڵ گەیشتنی بۆ سەر کارەکەی مۆبایلەکەی دادەخاتو سەرقاڵی ڕاپەڕاندنی کارەکانی دامەزراوەکەی دەبێت.

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: لە کاتی دەوامی فەرمیدا خۆی سەرقاڵ دەکات بە هەندێك کاری لاوەکیو تایبەتی خۆیەوە، بۆ وێنە مۆبایلەکەی، ڕادیۆکەی،...... هتد.

* فەرمانبەری ڕۆژئاوایی: ئەگەر گوێبیستی وشەی نەخێر بوو، چاکەو بەڵێی لەوەوپێشی بەڕێوەبەرەکەی دەهێنێتە پێش چاوی خۆیو لە دڵی خۆیدا پۆزش بۆ بەڕێوەبەر دەهێنێتەوەو دەڵێت: ڕەنگە ئەمڕۆ بارودۆخ وابخوازێت کە مۆڵەتم نەدات!

* فەرمانبەری ڕۆژهەڵاتی: هەرگیز نایەوێت لە زاری بەڕێوەبەرەکەیەوە گوێبیستی وشەی (نەخێر) بێت بۆ داواکارییەکانی، بۆ نموونە گەر داوای مۆڵەتی بۆ ڕۆژێك، یان چەند ڕۆژێك، یاخود ڕۆیشتنەوە پێش تەواو بوونی دەوامی فەرمی کرد، نایەوێت بەڕێوەبەرەکەی پێی بڵێ نەخێر، بەڵکو هەمیشە دەیەوێت بڵێ بە چاوان، خۆ ئەگەر بە درێژایی ساڵ تەنها یەکجار وتی نەخێر، ئەوا هەموو چاکەکانی لەوەوپێشی بەڕێوەبەرەکەی زەربی سفر دەکاتو تەنها حساب بۆ ئەو ڕۆژە دەکات کە پێی وتراوە: نەخێر!

بەو هیوایەی هەمووان هەوڵ بدەین ئەو فەرمانبەرە بین کە هەموو سیفاتە جوانەکانی تێدا کۆبووەتەوە، تا بتوانین فەرمانبەرێکی خۆشەویستو ویستراو دڵسۆز بین بۆ فەرمانگەکەمان، نەك نەویستراو بێزراو بێ سوود!

# تایبەتمەندییەکانی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو



چۆمان ئەحمەد
توێژەری کۆمەڵایەتی

بەڕێوەبەر بەوکەسایەتییە دەگوترێت کە یەکەمین پێگەو پۆستی کارگێڕی هەیە لە ناو شوێنی کارەکەیدا، یاخود ئەو کەسەیە کە لە ترۆپکی بەڕێوەبردنی ئیش‌و کارەکاندایە لە ناو فەرمانگەکەی، یاخود قوتابخانەکەی، یان دەزگاکەیدا هەروەك وتراوە: (ناوی بەڕێوەبەرێکی سەرکەوتووم پێ بڵێ، منیش ناوی دەزگایەکی سەرکەوتووت پێ دەڵێم)، بە ڕەچاوکردنی هەموو ئەم گرنگیانەی بەڕێوەبەرێکی نموونەیی لێرەدا لە پێشترین تایبەتمەندییەکانی دەخەینەڕوو:

١- بوونی پلان: یەکێکە لەو کارە بنەڕەتیانەی دەبێت بەڕێوەبەر بیری لێبکاتەوە تەنانەت پێش دەستبەکاربوون، ئەمەش دەبێت هەمەلایەن‌و وردو لۆژیکیانەبێت‌و بگونجێت لەگەڵ ئەو دەزگایەدا کە بەڕێوەبەر کاری تێدا دەکات، نابێت پلانەکان تاکڕەوانە دابنرێت بەڵکو بە ڕاوێژو بە گروپ بڕیاری لە سەربدرێت.

٢- ستراتیژییەت لە کاردا: لە دوای هەبوونی پلان لە تایبەتمەندییە سەرەکییەکانی بەڕێوەبەرە، کە بە واتای هەبوونی هونەری بەڕێوەبردن دێت، ئەو بەرنامەیەك یاخود ئەو پلانەی کە هەیە دەبێت ستراتیژیەت هەبێت لە شێوازی بەڕێوەبردن‌و پراکتیزەکردنی دا، بە بێ ڕەچاوکردنی ئەم خاڵە کارەکان پەرش‌و بڵاو بەڕێوەدەچن، لەبەرئەوەی ئەگەر پلان هەبێت، بەڵام ڕێگاوشێوازی جێبەجێکردنی بەهێز نەبوو، ئەوا پلانەکە ئامانجەکەی خۆی ناپێکێت.

٣- دەبێت بەڕێوەبەر ویستێکی باشی هەبێت بۆ کارکردن‌و بەردەوام‌و کۆڵنەدەر بێت لەسەر کارکردن بۆ ئامانجەکانی، پاشان هەڵگری ئەزموون‌و زانیارییەکی تەواوبێت لە بواری کارگێڕی‌و بەڕێوەبردنی کارەکەیدا، وەك هەڵسەنگاندنی تاکەکان‌و چۆنییەتی چاوپێکەوتنەکان لەبەرئەوەی بە تەنها ویستی مرۆڤ بۆ کارکردن بەس نییە، دەبێت ئەزموون‌و زانیاریشی لەگەڵدابێت، کاتێکیش فەرمانبەران هەست دەکەن بەڕێوەبەرەکەیان خاوەن لێهاتوویی‌و زانیارییە، متمانەیان پێی زیاتر دەبێت‌و هەست بە دڵنیایی‌و ئاسوودەیی دەکەن.

٤- بەڕێوەبەری سەرکەوتوو دەبێت لێهاتووییەکی باشی قسەکردنی هەبێت بە شێوازێکی سەرنجڕاکێش‌و سەرکەوتوو بێت لە کاتی شڵەژانەکان‌و کۆنتڕۆڵی بارودۆخەکان بکات، چاوپێکەوتنەکانیش بە باشی ئەنجام بدات.

٥- پەیوەندییەکی بەهێزو پیشەییانەی هاوسەنگی هەبێت لەگەڵ فەرمانبەرەکانی، لەگەڵ مامەڵەیەکی ڕەوشتیانەی بەرز، بەو شێوازە دەتوانێت ڕێزو خۆشەویستی چواردەوری بۆ خۆی بەدەست بهێنێت‌و هاندەرێکیش بێت کە فەرمانبەرەکانی لە ڕوانگەی دەروونییەوە ئاسوودەبن‌و ئارەزوویەکی باشیان هەبێت لە باشتر ئەنجامگەیاندنی کارەکانیان، خراپترین جۆری پەیوەندی‌و مامەڵەکردن ئەوەیە کە لەسەر بنەمای ئایدۆلۆجیاو بیروڕای سیاسی‌و مەزاجی کەسی‌و سۆزداری دروست ببێت.

٦-بیرکردنەوەکانی دەبێت لۆجیکیانەو لەسەربنەمای ژیری بێت، ڕاوێژ بە کەسانی چواردەوری بکات‌و لە دوای بیرکردنەوەیەکی درێژخایەن بڕیارەکانی بدات.

٧-کەسێکی دادپەروەر بێت لە نێوان فەرمانبەرەکانیداو جیاوازی نەکات لە نێوانیاندا، فەرمانبەران بە بینینی دادپەروەری لە لایەن بەڕێوەبەرەکەیانەوە زۆرتر متمانە پەیدا دەکەن‌و لایەنی مەعنەوییان بەرزتر دەبێتەوە.



# سوودی وەرزش چییە؟

ئا. محەممەد مێرگەیی

منداڵان زۆر دەبیستن کە وەرزشکردن سوودی زۆری هەیە بۆ مرۆڤ، بەڵام ئایا بە تەواوی ئەم سوودانەی وەرزش چین‌و مرۆڤ چۆن بتوانێت بەدەستییان بهێنێت؟

ئەنجامدانی وەرزش لە کاتێکی دیاریکراوی ڕۆژانەدا، یارمەتیدەردەبێت بۆ چالاککردنی لەش‌و بەرزکردنەوەی ئاستی وزەی مرۆڤ، هەروەك وەرزشکردن کاریگەرییەکی زۆرو باشی هەیە لەسەر چاکترکردنی زەوق‌و ڕەوشتی مرۆڤەوە.

**سوودەکانی وەرزش:**

شارەزایان ئامۆژگاری ئەوە دەکەن کە مرۆڤ ڕۆژانە بۆ ماوەی یەك کاتژمێر وەرزش ئەنجامبدات، ئەمەش لەبەر ئەم هۆیانە:

- وەرزش سوودی هەیە بۆ هەموو بەشێك لە بەشەکانی لەش‌و لەوانەش مێشك، وەرزش وا لە لەش دەکات کە ماددەی (ئەندرۆفین) دەربدات‌و ئەم ماددەیەش وا لە مرۆڤ دەکات بحەسێتەوەو هەست بە خۆشی‌و پشوودان بکات، هەروەك یارمەتیدەرە بۆ ئەوەی وا لە مرۆڤ بکات خەوێکی قوڵی لێبکەوێت، هەروەها هەستی باوەڕبەخۆبوون لە لای مرۆڤ زیاتردەکات.

- وەرزش ڕووخسارو ڕواڵەتی گشتی مرۆڤ باشترو جوانتردەکات، ئەو منداڵانەی کە بەردەوامو بەشێوەیەکی ڕێکوپێك وەرزش دەکەن، لەشییان کالۆری، واتە یەکەی گەرمی لەش- و چەوریی زیاتر دەسووتێنێت، بە بەراورد لەگەڵ ئەو منداڵانەی کە وەرزش ناکەن، لە ئەنجامی ئەمەشدا ئەم منداڵانەی وەرزشکارن، لەشێکی جوان‌و ڕێك‌و هەروەها کێشێکی تەندروست‌و نموونەییان دەبێت.

- وەرزش کێشی مرۆڤ دادەبەزێنێت‌و مرۆڤ دەپارێزێت لە نەخۆشییەکانی شەکرەو بەرزبوونەوەی فشاری خوێن.

- وەرزش سوودێکی ئاییندەیی هەیە کە لەوانەیە مرۆڤ گرنگی پێ نەداتو لە ئێستادا هەستی پێ نەکات، چونکە وەرزش بە تایبەتی وەرزشەکانی بازدان‌و ڕاکردن، ئێسکەکانی مرۆڤ بەهێزدەکەن‌و کاتێك کە مرۆڤ چووە تەمەنەوە ئێسکەکانی بە ئاسانی بێهێز نابێت.

**ئایا کام وەرزش گونجاوە بۆمان؟**

وەرزش زۆر جۆری هەیە، هەندێك وەرزش ئاسان‌و مرۆڤ دەتوانێت لە هەر شوێن‌و لە هەر کاتێك ئەنجامیان بدات، بۆ نموونە لە باخی گشتی، وەکو وەرزشەکانی ڕاکردن، ڕاکردن وەرزشێکی ئاسانەو سوودی زۆری هەیە بۆ مرۆڤ.

هەروەها وەرزشی تری زۆر هەن وەکو: یاری تۆپی پێ‌و سەبەتەو تایکواندۆو یارییەکانی هێزو.... چەندینی تر، کە هەموویان بەسوودو خۆشن، گرنگ ئەوەیە کە تۆ بە پێی ئارەزووی خۆت یەکێك، یان چەند وەرزشێك لەوانە هەڵبژێری‌و بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ئەنجامی بدەیت.

**ماوەی وەرزشی ڕۆژانە چەند بێت؟**

واچاکە هەفتانە (٦) ڕۆژ وەرزش ئەنجامبدرێت، بەشێوەیەك لە هەر ڕۆژێکدا ماوەی (٣٠-٦٠) خولەك بێت، دەبێت ڕۆژێك بە تەواوی هیچ وەرزشێك ئەنجام نەدرێت، تاکو ماسولکەکان پشوو بدەن.

**کام خواردنانە سوودیان هەیە بۆ وەرزشەوانەکان؟**

کاربۆهیدارتی، وەك (نان‌و برنج‌و مەعکەرۆنی) وزە بە لەشی مرۆڤ دەبەخشن، هەروەها میوەو سەوزەکانیش زۆر بەسوودن.

وا باشە ئەم جۆرە خواردنانە لە پێش ئەنجامدانی وەرزش بخورێن، بەڵام لە پاش ئەنجامدانی وەرزش واچاکە پرۆتینەکان بخورێن، وەك: (هێلکەو گۆشتی مریشك‌و گۆشتی سوورو ماسی)، ئەمەش بۆ خۆراك پێدانی ماسولکەکان کە لە کاتی ئەنجامدانی وەرزش مرۆڤ زۆر بە کاریان دەهێنێت.

هەروەك دەبێت وەرزشەوانەکان دوورکەونەوە لە خواردنی شیرینەمەنییەکانی وەك: (بسکویت‌و شکۆلاتە)، چونکە ئەم جۆرە خواردنانە ڕێژەیەکی زۆری چەوری‌و شەکریان تێدایە، هەروەها خواردنی ئەم شیرینیانەش وا لە مرۆڤ دەکەن هەست بە تەممەڵی بکات‌و وزەی پێویست بە مرۆڤ نابەخشن.

**بۆچی هەندێك کەس حەز لە وەرزش ناکەن؟**

لەوانەیە لەبەرئەوەبێت ئەوان ئەو وەرزشە ئەنجام نادەن کە بە لایانەوە پەسەندە، یان ئەوەتە هێشتا ئەوان وەرزشێکیان نەدۆزیوەتەوە کە بە لایانەوە پەسەندە.

ئەنجامدانی ئەو وەرزشەی کە مرۆڤ بە لایەوە پەسەندەو خۆشی‌و چێژی لێوەردەگرێت، وای لێدەکات کە بۆ ماوەیەکی زیاتر لەسەر ئەنجامدانی بەردەوام بێت، بۆیە خۆت ناچار مەکە لەسەر ئەنجامدانی وەرزشێك کە ئارەزووی لێ ناکەیت، چونکە تۆ لەسەری بەردەوام نابیت‌و لەسەری ناڕۆیت.

سەرچاوە: گۆڤاری (العربي الصغیر) ژمارە ٢٢١ ساڵی ٢٠١١

وەهاب حەسیب محەممەد



# ئیمپڕاتۆری نەوت جۆن د. ڕۆکفلەر

**جۆن د. ڕۆکفلەر- سەرۆکی ئەنجوومەنی کارگێڕی کۆمپانیای ئستانداردئۆیل -١٨٣٩- ١٩٣٧/ فردملیز- نیۆرك**

پێشەکی: ڕەنگە زۆرێکمان ئەم پرسیارە لە خۆمان بکەین، بۆچی سەرمایەدارەکان بە زۆری لە ڕۆژئاوادا دەردەکەون، بەڵام لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا دەوڵەمەند بوونو دەرکەوتن بە شێوەیەکی دیکەیە؟ زۆرجار خەڵك لە ڕێگەی سیاسەتەوە دەبن بە سەرمایەدار، زۆر بە سادەیی لەو وڵاتانەدا دەزگاو دامەزراوە جۆراوجۆرەکان لە ژیانی ئابوریو ڕامیاریی خەڵکدا مێژوویەکیان هەیە، خەڵکی کاتێك باج دەدەن بە حکومەت بەشداری ژیانی ئابووریو ڕامیاریو... دەکەن بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ، سەرەڕای ئازادی ڕۆژنامەکانو سەربەخۆیی دادگاکانو...، سەرباری کرانەوەی ئەو کۆمەڵگایانە بە ڕووی تواناکانی خەڵکدا، بەڵام لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا حکومەت دەست بەسەر هەموو کەناڵێکی ژیاندا دەگرێتو ماوە بۆ بەشداری ڕاستەوخۆی خەڵك ناهێڵێتەوەو دادگاکان سەربەخۆ نینو...، ئەمانەش هۆکارگەلێکن بۆ تاڵان کردنی سامانی نەتەوەییو خەفەکردنی بەهرەی هاوڵاتیانو...، گردبونەوەی سەرمایە لە دەست چینێکی دیاریکراودا. چینی سەرمایەدار لە باکوری گۆی زەویدا دەستیان هەبووە لە پێشخستنو بەرەو پێشبردنی کۆمەڵگادا لە بواری ژێرخانو سەرخانی کۆمەڵگادا، لە کاتێکدا لە وڵاتانی جیهانی سێیەمدا ڕۆڵی سەرمایەداران تەواو جیاوازە. لێرەدا سەرگوزەشتەی سەرمایەدارێك دەخەینە بەرباس بۆئەوەی خوێنەر بەلای کەمەوە هەست بکات کە هەموو کەس، پەروەردگار توانای زۆرو جۆراوجۆری پێبەخشیوە، تا خۆی لاکەم نەبێتو لە لایەکی ترەوە بتوانێت بەکاریان بێنێت لەو بوارەدا کە دەیەوێت کاری تیادا بکاتو دەربکەوێت.

جۆن دافیسۆن ڕۆکفلەر(١٨٣٩- ١٩٣٧) بە جۆن د. ڕۆکفلەری باوك بە ناوبانگە، وەك جیاوازییەك لەگەڵ جۆن د. ڕۆکفلەری کوڕدا (١٨٧٤- ١٩٦٠)، ڕۆڵێکی تەوەری هەبوو لە دروستکردنی پیشەسازی نەوت لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمریکادا.

جۆن دافیسۆن ڕۆکفلەر بە یەکێك لە دەوڵەمەندە بە ناوبانگەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان دێتە ئەژمار، ئەگەر بەناوبانگترینیان نەبێت، کەسێکە بە سەرەتایەکی خۆبەکەم زانەوە دەستی پێکردووەو پاشان بوو بە یەکێك لە بە ناوبانگترین کەسایەتییەکانی جیهان، تەنانەت بوو بە پێشەنگ بۆ زۆرێك لە سەرمایەدارەکانی جیهان، ئەم خانەوادەیە لە سەرەتای جەنگی ناوخۆیی وڵاتەیەکگرتوەکانەوە دەرکەوتن. ڕۆکفلر دەلاڵ (جامباز)ی شمەکی بچوکی کشتوکاڵی بوو لە کلیفلاند لە ئۆهایۆ، دواتر کۆمپانیای ستانداردو هاوبەشەکانی لە ساڵی ١٨٦٣ دامەزراند، پاشان سەرمایەی ئەم خانەوادەیە بەشێوەیەك کەڵەکە بوو ٩٥٪ی بازرگانی گواستنەوەی نەوتی ئەمریکایان لە ژێر دەستدا بوو.

پاشان لە ساڵی ١٨٨٩ کارەکەی فراوانکرد بۆدامەزراوەیەکی قۆرخکاری زەبەلاح بەناوی (ستاندارد ئۆیل ئێف نیوجرسی)، بەڵام ساڵی ١٩١١ دادگایی فیدراڵی بە مەبەستی سەلامەتی ویلایەتەکان دژ بەو یەکگرتنە بوو، سەرەنجام لە کۆی سیو سێ

کۆمپانیا کە دادگای ناوبراو هەڵیوەشاندەوە ڕۆکفلەر چواریەکی پشکەکانی دەستکەوتو بوو بە بلوێنێری یەکەم لە ئەمریکادا.

ژیانــی منداڵــی ڕۆکفلەر پــڕ بوو لە پێچەوانەکان، ئەو شێوە ژیانە کاریگەریان بەســەریەوە هەبــوو، بە شــێوەك باوکی پیاوێکی دوور لــە دینو دوور لە بەهاکان بــوو، زۆرجــار لەگــەڵ زارۆکەکانیشــی ناڕاســت بــوو، بــە پێچەوانــەوە دایکــی کەســێکی میهرەبــانو پەیوەســت بوو بە ئایــنو بەهاکانەوەو کەســێکی ڕاســتگۆو خۆشەویستی هەمووان بوو.

لەگەڵ هەموو ئەم ڕاستیانەشدا ڕێگای باوکی گرتــە بەر لە بازرگانیــدا، چونکە ئەو هەمیشــە ئامۆژگاری دەکرد کە سۆزو خۆشەویســتی لەگــەڵ بازرگانیــدا تێکەڵ نــەکات، هەریەك بەپێی خۆییو لەســەر ئەو بنەمایە باوکی هەڵســەکەوتی لەگەڵ دەکــرد، باوکــی ئەو کە بە بیــل ڕۆکفلەر ناســرابوو، کارەکەی تاڕادەیەك نامۆ بوو، ئەو بازرگانی بە ڕۆنی مارەوە دەکرد..

کاتێــك تەمەنــی تەنها شــازدە ســاڵ بــوو بــە ڕۆژانــەی ٦٠ســەنت کاری بــۆ کۆمپانیایــەك دەکــرد، کارەکــەی بریتی بوو لە کۆکردنەوەی کرێ لە کرێنشــینانی کۆمپانیــای ناوبــراو، ئــەم کارەیــی وای دەخواست چەندین کاتژمێر لە چاوەڕوانی قەرزدارەکانــدا بێت، تــا هەقی کۆمپانیای ناوبراویــان لێوەرگرێت بۆ ڕزگاربوون لێی گەلەك جار قەرزدارەکان خۆیان دەشاردەوە وەك هەوڵێك بۆ خۆ ڕزگارکردن، بەدیوێکی تــردا جــۆری کارەکــەی وایلێکردبوو کە خۆشەویســتی خەڵــك نەبێــت. بــە هۆی خۆشەویســتیو توانای زۆریەوە بۆ ژمارەو ژمێریاری لــە پیشــەکەیدا بەرزکرایەوەو بوو بە ژمێریــاری کۆمپانیاکە، بۆ ماوەی سێ ســاڵ لە کارەکەیدا بەردەوام بوو، لەم کارەیــدا ٨٠٠$ی پاشــکەوت کــرد، ١٠٠٠$ دیکەشی لە باوکی وەرگرت، لەگەڵ کەسێك بەنــاو مۆریــس کلارك کۆمپانیایەکیــان دامەزراندو بوون بە دەڵالی گواســتنەوەی شــمەك، ئــەو شــمەکانەی ئــەوان کاریان تیادا دەکرد، بریتی بوون لە دانەوێڵە، کا، گۆشتو... هتد.

لەگەڵ هاوکارەکەیدا پەرەی بە کارەکەی داو داهاتی باشــیان لەو کارەدا هەبوو، بەڵام کاتێــك نەوت لە ســاڵی ١٨٥٩ لــە ڕۆژئاوایی پەنسلڤانیا دۆزرایەوە دۆزینــەوەی ناوبراو نیمچە تەقینەوەیەك بوو لە دروســتکردنی پاڵاوگــەی نەوتدا، ئــەو کارەش هاندەر بوو بۆ ڕۆکفلەر کە لە ســاڵی١٨٦٣دا پاڵاوگەیەکی نەوت دابمەزرێنێت، سەرەتا ئەو گرنگییەکی زۆری بەو ئیشــە نــەدەدا، چونکە بازرگانی گواســتنەوەی دانەوێڵە بــۆ ئەو کارێکی فرە داهات بوو لەم ســەروبەندەدا مەبەستی بوو لە ژیانــی تایبەتیدا وچانێك بداتو بڕیاری دا خێزان دروســت بــکات، دواتر چووە نێو ژیانــی خێزانییــەوە، هاوســەرەکەی نــاوی (لــۆرا سلیســتاین) بوو، هاوڕێی ســەردەمی قوتابخانــەی بــوو، دواتــر هەمیشــە جۆن دەیگوت ئەگەر ئامۆژگارییەکانی لۆرا نەبوایە من کەســێکی هــەژار دەبــووم لــە ژیاندا، (دەگوترێــت ڕۆکفلــەر دووجار لــە ژیانیدا گریاوە جارێك کە هاوسەرەکەی کۆچی دوایی کرد، ســاڵی ١٩١٥، جارێکی تر کە خانەنشین کــرا)، هەنگاو بەنگاو ڕۆکفلــەر لە بازرگانی دانەوێڵەوە هەنگاوی هەڵدەنا ڕووەو ئاڵتونی ڕەش، کــە بــە خوێنی تــازەی بازرگانی ناو دەبرا لــەم بوارەدا جۆن بڕیــاری دا یەکەم کــەس بێت. لەم کاتانەدا بواری پیشەســازی هەڵوەشــاوەو نــا کاریگەربــوو، ئەمــەش چانســێکی باش بوو بۆ ڕۆکفلەر تا زۆرێك لە کارەکان بــاش بکاتو بیانخاتە گەڕ تا زیاتر دەربکەوێــتو بناســرێت، لــەو هەنگاوانەدا سەرکەوتوو بوو بە هۆی کارسازیو ئارەزووی لە بەڕێوەبردندا بە دەســتێکی پۆڵایین، لەم کاتانەدا جۆن بیری لە قازانجو پاشــەکەوتی هەر سەنتێك دەکردەوە.

دەســتیکرد بەکڕیگرتنــی بارهەڵگرو پاشــان بەرمیلــی نەوتی دروســتکرد، (تا ئــەو کاتە گواســتنەوە تەنها لە ڕێگای بار هەڵگرەکانــەوە پیــادە دەکرا) بــە هیوای کەمکردنەوەی کرێی گواســتنەوە هەروەها دەرچوو.

نرخــی گواســتنەوەی یــەك بەرمیل نەوت لە ٢،٥$ دابەزیی بۆ ٩٦سەنت، لەگەڵ ئەوەشــدا جۆن بڕیــاری وابوو باشــترین کاریگــەری هەبێت بە کەمترین داهات، لە یەکێك ســەردانەکانیدا بــۆ کۆمپانیاکەی سەیری کرد بەرمیلێکی نەوت بە ٤٠ پارچە لحام پێکەوەی دەبەستن، فەرمانی دەرکرد پارچەکان بکەن بە ٣٨ کاتێك دەرکەوت لە ٣٩ پارچە کەمتر بێت، بێکەڵکە، یەکێك لە هاوکارەکانی پێی گوت ســودی یەك پارچە چییــە؟ ئەو گوتی لــە مەودایەکی دووردا سامانێکی زۆری پێ پاشەکەوت دەکرێت.

ئەو وایدەبینی کە بازرگانی پێویستی بە زرنگیو زمانپاراویو سوودوەرگرتنە لە هەلــەکان، بۆیە بە هــاوکاری هاوکارەکەی (هێنــری فلاغلــەر) هەمــوو پاڵاوگەکانی نەوتی لە ئەمریکادا کڕیو ئەو پاڵاوگانەی نەچوونە ژێر داواکاریەکانییەوە تەڵەکەی بازرگانــی لەگەڵــدا بەکاردەهێنان، بەوەی ناچاری داخســتنی دەکردنو پاشان لەگەڵ کۆمپانیاکانــی هێڵــی ئاســندا تیمێکیــان پێکهێنا لە بواری گواستنەوەی نەوتدا، لەم کارەشدا پشکی شێر بۆ جۆن بوو.

ئــەو کەســێکی بێبەزەیــی بــوو لــە بازرگانیدا، یەکێك لە براکانی (فرانك) کە ڕکابەری بوو ئەوی بە تەواوی لەو بوارەدا تێکشکاندو نابووتی کرد، هاوکات برایەکی دیکەی (ولیام) کە ئامادەبوو هاوکاری بێت ئەوی گەیاندە ڕیــزی ملیۆنێرەکان، دواتر ڕاگەیاندنــەکان زۆریان لەســەر ڕۆکفلەرو نایاســایی کۆمپانیــای ئســتاندارد ئۆیــل نووســی، لە کاتێکدا ئــەو دەوڵەمەندترین پیــاوی دنیابوو، جێگای تێڕوانینی زۆرێك بوو.. بەڵام ئەو هیچ کات هەستی بە تاوان نەکرد بەرانبەر ئەو کارانەی کردبووی لە پێنــاو دەوڵەمەند بــوونو کەڵەکەکردنی ســاماندا، وەك پێدانی بەرتیلو... چونکە ڕۆکفلــەر وایدەبینی کە بازرگانی کایەیەکە بــواری ســستیو کەمتەرخەمــیو بەزەیی تیاجێ نابێتەوە، لە کاتێکدا بە هیوای قازانج بکەیت. لە بەرانبەردا جۆن وایدەبینی کە پیشەســازی نەوتــی دەوڵەمەنــد کردووە لــە ئەمریــکاداو بەبیــرو بۆچوونەکانــی خزمەتی وڵاتو هاوڵاتیانی کردووە، بەڵام ئەو نووســینانە دواتــر کاریگەری خۆیان هەبوو لەســەر ڕۆکفلەرو هەستی بە ئازاری ویژدانــی دەکــرد، لە کۆتاییــدا ڕوویکردە کاری خێرخــوازی بە هیــوای جوانکردنی ســیمای خۆییو کۆمپانیاکەی لەبەرچاوی خەڵكو میدیاکان نزیکەی پێنج سەد ملیۆن دۆلاری لــە ژیانیدا لــە کاری خێرخوازیدا خەرجکرد.

لــەو کارانــەی ڕۆکفلــر ئەنجامیــدا: بنیاتنانــی زانکۆی شــیکاگۆ ســاڵی ١٨٩٢، پاشان بنیاتنانی ناوەندێکی پزیشکی ساڵی ١٩٠١ گۆڕا بۆ زانکۆی ڕۆکفلەر، دامەزراوەی ڕۆکفلــەر بــۆ کاری خێرخوازی لە ســاڵی ١٩١٣داو جۆن دافیســۆن ڕۆکفلر لە تەمەنی ٩٨ ســاڵیدا لە ساڵی ١٩٣٧ کۆچی دواییکرد، تــا ئەمڕۆ زیاتر لە حەفتا ســاڵ بەســەر دواکۆچــی ڕۆکفلــەردا تێپەڕیــوە، بــەڵام ناووناوبانگی ئەو هەمیشــە زیندووە، وەك هاوتایەك بــۆ: پارە، ناوبانگ، دەســەڵات، ســێکەس لە بنەماڵەی ڕۆکفلەر گەیشتوون بە پلــەی جێگری ســەرەك کۆماری وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تا ساڵی ١٩٧٧.

# لێدوانەکانی کۆتلر لە بازاڕسازیدا

بەشی چوارەم
هاژە شێروانی




## بەرەو بازاڕسازی نوێ

دوابەدوای دوان لەسەر بەشەکانی ڕابردوو لە لێدوانەکانی کۆتلەر لە بازاڕسازییدا کە بریتی بوون لە دروستکردنی کاری بازرگانی قازانجدار لە ڕێگای بازاڕسازی جیهانی، ئایا بە ئەنجامگەیاندنی قازانجدار هەیە لە بازاڕسازی؟ ستراتیژیەتی بازاڕسازی قازانجدار چی پێکدەهێنێت؟ بە داوای لێبوردنەوە کە لە ژمارەی ڕابردوو لە بەشی چوارەم دابڕاین، ئەوا پشت بەخوا لەم ژمارەیەدا لەگەڵتان بەردەوام دەبین بۆ دوان لەسەر ئاراستەی بازاڕسازی نوێ، هەروەك دەزانینو جێگای سەرسوڕمانیش نییە کە زۆرێك لە بەرپرسانی جێبەجێکار لە کۆمپانیاکان (CEOs) گلەیی ئەوە بکەن کە بازاڕسازییان کاریگەر نییە، ئەوان دەبینن کە کۆمپانیاکانیان زۆر خەرج دەکات لە بازاڕسازیداو لە بەرامبەردا دەسکەوتی کەمە. یەکێك لە هۆکارەکانی ئەوەیە کە زۆر خەرج دەکەن لەسەر هەمان ڕێچکەی کۆنی بازاڕسازی ئەوەی کە لە سەری ڕاهاتوون لە ڕابردوودا، کە بازاڕسازی ڕەسەنیش پێکدێت لەم کارانەی خوارەوە:

- یەکسانبوونی بازاڕسازی بە فرۆشتن.
- تیشك خستنە سەر داواکاری کڕیار لە کڕین، نەوەکو بایەخدان بە کڕیار.
- هەوڵدان بۆ دەستخستنی قازانج لە هەر مامەڵەیەك لەگەڵ کڕیار لە بری هەوڵدان بۆ دەستخستنی قازانج لە ڕێگای بەڕێوەبردنی بەهاداری کڕیار بە درێژایی ژیان.
- دانانی نرخەکان بە پشت بەستن بە تێبینی تێچوونی لە بری نرخە ئامانجدارەکان.
- پلاندانان بۆ هەموو ئامێرێکی پەیوەندی بە جیا لە بری تەواوکاری پەیوەندییەکان لەگەڵ یەکتری.
- فرۆشتنی بەرهەم لە بری هەوڵدان بۆ تێگەیشتنی پێداویستی ڕاستەقینەی کڕیارو پڕکردنەوەی.

هەر بۆ بێ بەختی بیرکردنەوەی کۆنی بازاڕسازی ئێستا بواری دا بە ڕێگای بیرکردنەوەی نوێ. کە کۆمپانیاکانی بازاڕسازی زیرەك پەرەیاندا بە زانینی کڕیارو تەکنیکەکانی بە یەکبەستنەوەی کڕیارو تێگەیشتنی ئابوورییەکانی کڕیار. کە بانگێشتی کڕیارەکان دەکات بۆ هاریکاری لە دیزاین کردنی بەرهەم. هەروەك ئامادەیە بۆ پێشکەشکردنی خستنەڕووی نەرمونیان لە بازاڕ، هۆیەکانی ڕاگەیاندنیش بەکاردێنێت کە ئامێرەکانی گەیاندنی بازاڕسازی یەکدەخات بۆ گەیاندنی پەیامێکی جێگیر لە ڕێگای هەر کڕیارێك کە پەیوەندی بکات. هەروەك تەکنەلۆژیای پێشکەوتووش دەخاتە کار وەکو کۆنگرەی ڤیدیۆییو بە ئامێرکردنی فرۆشتنو پرۆگرامو لاپەڕەکانی ماڵپەر لە ئینتەرنێتو ئەنترانێت (گەیاندنی ناوخۆی کارگێڕییەکانی کۆمپانیا)و ئەکسترانت (گەیاندن لەگەڵ کۆمپانیاکانی تر). کە بە ئاسانی پێی دەگات بە درێژایی ڕۆژەکانی هەفتەو بۆ ماوەی ٢٤ کاتژمێری ڕۆژانە، لەسەر ژمارە تەلەفۆنی تایبەت بە کڕیار کە بە ژمارە ٨٠٠ -١ دەست پێدەکات، یان لە ڕێگای پۆستەی ئەلیکترۆنی، کە زۆر توانادارترە لەسەر دیاریکردنی ئەو کڕیارانەی کە قازانجی زیاتر دەستەبەردەکەنو لە سەردانانی ئاستە جیاوازەکانی خزمەت. وا لە کەناڵەکانی دابەشکردنیش دەڕوانێت وەك ئەوەی کە هاوبەشییەتی نەوەك دوژمنی، لە کۆتاییدا ئەو هۆیەی دۆزییەوە بۆ گەیاندنی بەرزترین بەهای ئاستی کڕیارەکانی.

هەروەك پاداشتیش بۆ ئەو کۆمپانیایانە دەڕوات کە هۆیەکانی گەیاندنی نوێ دادەهێنێت بۆ داهێنانو پەیوەندی دەکاتو بەهایەك دەگەیەنێت بۆ بازارە ئامانجدارەکانیان. کە دەتوانین ناویان بنێین (خەیاڵییەکانی بازاڕسازیMarketing Visionaries ) کە پێویست دەکات وەکو ئەم کۆمپانیایانە لە هۆڵی بەناوبانگی بازاڕسازیدا ڕێزیان لێبگیرێت.

لێرەوە پێویستە ئەوە بزانین کە بازاڕسازی زۆر جیاوازترە لە ماوەی دەیەی یەکەمی سەدەی بیستو یەك، لێرەدا بیرۆکەکانی خۆم دەخەمە سەر ئاراستەی بازاڕسازی لە هەزارەی نوێ، ئەم کارەشم (بەڕوانینە لە دواوەی ئایندە). ئەمەی خوارەوەش ئەو پێشکەوتنە بنەڕەتیانەیە لە شوێنی بازاڕ- ڕووبەری بازاڕ- Marketplace/ Market spaceکە نێوەندکارییەکی خراپ هەبوو لە نێوان فرۆشیاری بەکۆو فرۆشیاری بەدانە بە هۆی بازرگانی ئەلیکترۆنی. لە واقیعیشدا دەبینین کە هەموو بەرهەمەکان بەردەستن بەبێ ئەوەی کە لە وێنە بازرگانییەکان بخرێنە ڕوو. کە بەکاربەر دەتوانێت وێنەی هەر کاڵایەك لەسەر ئینتەرنێت ببینێتو تایبەتمەندییەکانی بخوێنێتەوەو بە باشترین نرخو خستنەڕووش لە فرۆشیاری بکرێت لە دواییدا کلیك لەسەر فەرمانی کڕین بکاتو نرخەکەشی هەر لە ئینتەرنێت بدات، کە وایکرد ئەو کەتەلۆکانە ون بن کە تێچوونی چاپکردنیان بەرز بوو. هەروەك کڕین لە کۆمپانیایەك بۆ یەکێکی تر زیاتر لە کڕینی بەکاربەر لەسەر ئینتەرنێت. نوێنەری کۆمپانیاکان وایان لێهات کە کاڵا دووبارەکانیان لە ڕێگای ئینتەرنێتەوە بفرۆشن، یا بە ڕیکلامکردنە لە پێداویستیانو چاوەڕوانی خستنەڕووی ئارەزوومەندانیەتی، یان بە

گەران بە شێوەیەکی سانایە لە ڕێگای ماڵپەرەکانی تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی **web** لەسەر پەرتووکەکانی کە بەناو سەیف دەکرێت **Book marked**.

هەروەك بازرگانی بەدانەش لە کۆگا بازرگانییەکان وایدەبینێت کە جووڵەی ناوخۆیی (یان جووڵەی کڕیارەکانی) ونبوون، وەکو کاردانەوەیەك، بازرگانی بە دانە هەڵساون بە وەبەرهێنان لە بیناکردنی شانۆو شوێنی ڕابواردن لە شوێنە بازرگانییەکان.

لە ئێستاشدا زۆرێك لە فرۆشگاکان دەستیان کردووە بە فرۆشتنی پەرتووکو خواردنو کۆگاکانی جلوبەرگیش هەڵساون بە دابینکردنی قاوەخانەو پێشکەشکردنی وانەو خستنەڕووی هونەری، پێویستیشە کە ئەم فرۆشگایانە «شارەزایی بە بازاڕ بخات» لە بری بە بازاڕخستنی تێکەڵەیەك لە بەرهەمەکان.

کە زۆرێك لە کۆمپانیاکان هەڵساون بە دیزاینکردنی بنکەیەکی داتایی تایبەت بە کڕیارەکان کە زانیاری زۆر دەگرێتە خۆی لەوەی کە پێی باشەو کڕیار دەیەوێت لەسەر بنەمای تاکەکەسی کۆمپانیاکانیش ئەم زانیارییانە بەکاردەهێنن بۆ دیزاینکردنی بەرهەمی تاکەکان لەسەر بنەمای پێ باشترینی بە کۆمەڵ. کە کۆمپانیاکان هەڵدەستن بە خستنەڕووی ژمارەیەك لە پلانی بەرهەمەکانیان لەسەر سکرینی داتاکان کە ڕێگە دەدات بە کڕیارەکان بە دیزاینکردنی بەرهەمەکانیان کە ئارەزوویانە. زۆرێك لە کۆمپانیاکانی ئۆتۆمبێلو کۆمپیوتەرو ئامێری ناوماڵو کۆمپانیاکانی خۆراك بانگێشتی کڕیارەکانیان دەکەن بۆ ڕوانین لە لاپەڕەی ماڵپەرەکانیان لەسەر تۆڕی وێبو دیزاینی خستنەڕووی بازاڕ دەکەن (بەرهەم، یا خزمەت، یا سیستەم، یا پرۆگرام) لە ڕێگای پڕکردنەوەی هەڵبژاردنەکان کە لەسەر مۆدێلەکە دانراون. لە دوایدا بەرهەمە پەرەپێدراوەکە لەسەر شاشە دەخرێتە ڕوو.

کۆمپانیاکانیش کاری باش دەکەن بۆ پاراستنی کڕیارەکانیان لە ڕێگای دۆزینەوەی هۆیەکانی داهێنان بۆ بە پێشکەوتنی پێشبینیەکانی کڕیار. کە لە دەرەنجامیشدا ڕکابەرەکان ئەوەیان دۆزییەوە کە ئاستەم بێت کڕیاری نوێ بۆ خۆی کێش بکات، هەر بۆیە کۆمپانیاکان کاتی زیاتریان دەوێت بۆ بیرکردنەوە لە چۆنیەتی فرۆشتنی خزمەتو بەرهەمی زیاتر بۆ کڕیارەکانی ئێستایان.

هەر وەك کۆمپانیاکان دەستیان کرد بە تیشکخستنە سەر دابینکردنی بەشێك بۆ کڕیار لە بری بەشێك بۆ بازاڕ، هەروەك دەستیکرد بە دەستخستنی کەرتەکانو دیدگەی کڕیارەکانی لە (گەنجینەی زانیارییەکان) لە ڕێگای پراکتیزەکردنی هۆیە نوێیەکانو کاریگەرەکان لە پوختکردنەوەی زانیاری.

لە کۆتاییدا، کۆمپانیاکان سەرکەوتن لە بەڕێوەبردنی ژمێریاریان بۆ دەستخستنی ژمارەی ڕاستەقینە لە قازانج بە گوێرەی کەرتو کڕیاری تاکو بەرهەمو کەناڵو یەکەی جوگرافی. کە لە ئێستادا وابکات کۆمپانیاکان زیاتر بە ئاگابن لە تیشك خستنە سەر کڕیارەکان، بەرهەمەکان، کەناڵە قازانجدارەکانی، بە ئامادەکردنی کۆمەڵێك دیاریو پاداشت بۆ کڕیارە هەر بە قازانجەکانیان.

کۆمپانیاکانیش گۆڕان لە ڕوانینی ئاڵوگۆڕ، بۆ ڕوانینی بنیاتنانی چوونە ڕیزی کڕیار. زۆرێك لە کۆمپانیاکانیش گواسترانەوە بۆ چەمکی (هاندانی کڕیار بە درێژایی ژیان) کە چۆنیەتی گەیاندنی بەرهەمێك دەخاتە ڕوو کە بەکاربێت بە ڕێكوپێکی (وەکو قاوە خواردنەوە ساردەکان) بە ڕێگایەکی ڕێكو بە نرخی کەمتر بۆ یەکەیەك، هەروەك ئەم کۆمپانیایانە دەتوانن کە دەستەبەرکردنی قازانجێکی کەم هەڵبگرێت لە هەموو بارێك کە ڕێژەیەك دەفرۆشێت بۆ پەیماننامەی کڕینی درێژخایەن.

زۆربەی کۆمپانیاکان لە ئێستادا لە پەیماننامەدان لە گەڵ کۆمپانیاکانی تر **Out Source** لە زیاتر ٦٠٪ی چالاکیو داواکارییەکانیان، کەمتریان پەیماننامە دەکات بە ڕێژەی ١٠٠٪ کە لە لایەنی پراکتیکی وادەکات کە کۆمپانیایەك بێت هەبووی کەمتری هەبێتو لە دوایدا ڕێژەیەکی زۆر گەورەی لە داهات بە دەستبخات، ئەو کۆمپانیایانەی کە پەیماننامە لەگەڵ کۆمپانیای تر دەکەن بە بەرزبوونەوەی کارە بازرگانییەکان چێژ وەردەگرن، لە کاتی دروستکردنی ئامێرەکان زۆربەیان پێیان باشترە کە کار بکەن لەگەڵ هاوبەشە دابینکارەکان لە تاکەکان کە هەڵدەستن بە دیزاینکردنو هێنانی سیستەمی تەواوکار (سیستەمی فرامڵی ئۆتۆمبێلو کوشنەکان..... هتد) بە هاوبەشی لەگەڵ خاوەن نیشانە بازرگانییەکە. زۆربەی کۆمپانیاکانی ئەمڕۆ کۆمپانیای بە یەك گەیەنراون بە تۆڕێكو پشت بەستوون بە شێوەیەکی گەورە بە هاوپەیمانییەتی ستراتیژی لەگەڵ کۆمپانیاکانی تر، زۆربەی پیاوانی فرۆشتنی مەیدانی خاوەنی نایابن **franchises** زیاتر لەوەی کە فەرمانبەری کۆمپانیا بن، کە کۆمپانیا نوێترین ئامێری فرۆشتنی ئەلیکترۆنیان پێدەدات لەوەی تواناداره لەسەر پەرەپێدانی خستنەڕووی تایبەت بە نیوەندی کارە جۆراوجۆرەکان **Multimedia**و دیزاینکردنی ڕێکەوتننامە بە گوێرەی داواکاری کەسی لە خستنەڕووەکانی کە بازاڕ پێشکەشی دەکات، زۆربەی کڕیارەکان پێباشترینی خۆیان بە ڕوونی دەردەخەن بۆ بەرامبەرکردنی پیاوانی فرۆشتن لەسەر سکرینی کۆمپیوتەر لە چاو چاوپێکەوتنی نووسینگە، ڕێژەی زۆری فرۆشتنی کەسی دەبێت لە ڕێگای هۆیەکانی ئەلیکترۆنی کە کڕیارو فرۆشیار لایەنەکەی تر دەبینن لەسەر سکرینی کۆمپیوتەر. هەروەك پیاوانی فرۆشتن زۆر گەشت ناکەنو هێڵەکانی فڕۆکەوانیش قەبارەکەی لاردەبێتو زۆربەی پیاوانی فرۆشتنی کاریگەریش زۆر لێزانترنو متمانەیان پێدەکرێتو خۆشەویسترو گوێگری کاریگەرن.

هەروەك ڕیکلامکردن بە گشتی لە تەلەفزیۆن زۆر زیادی کردووە بە بەراوورد بە توانای بینینی نزیکەی ٥٠٠ کەناڵ، هەروەك ژمارەی ڕۆژنامەو گۆڤارە چاپکراوەکان کەم بووەتەوە، لە لایەکی تر بازاڕسازان دەتوانن کە بەو بازاڕە بگەن کە ئامانجیانە بە کاریگەرییەکی زیاتر لە ڕێگای ڕیکلامکرن لە گۆڤارە تایبەتەکانو کۆمەڵەی هەواڵەکان لە ڕێگای سکرینەوە. کە کۆمپانیاکانیش ناتوانادارن لەسەر مانەوە بە جیاکەرەوەی ڕکابەری (دەرچوو لە چوارچێوەی نیشانەی بازرگانیو مافی لە چاپدانو ماڵپەری ناسینەوەو زانیاری خاوەن موڵك.... هتد). کە ڕکابەران خێران لە کۆپیکردنی هەر ناسینەوەیەکی (ڕکابەری) لە ڕێگای ئاماژەپێکردنە پێوانەییەکانو فێربوون لە جیاکەرەوەکاران **Benchmarking** و ئەندازەیی پێچەوانەو بازدان بۆ لایەکی تر. کە کۆمپانیاکان باوەڕیان وایە کە تاکە ناسینەوەی ڕکابەری کە دەتوانین لەسەری بمێننەوە بریتین لە پشتبەستن بە توانای لەسەر فێربوونو گۆڕان زۆر بە خێرایی.




ئەگەر سەربوردێکی خێرا بەلاپەڕەکانی مێژوودا بکەین‌و بە ژیانی کەسایەتییە کاریگەرەکانی ناو مێژوودا بگەڕێین، دەبینین کە گوفتارو ڕەفتاریان هەماهەنگ بووەو گوفتارەکانیان کردووە بە کردار، بۆیە توانیویانە ئامانجەکانیان بپێکن‌و کەسانێکیش لە دوای خۆیان بەیداخی بیروبۆچوونەکانی ئەوانیان هەلگرتووەو بۆی تێکۆشاون‌و لە دوای نەمانیشیان ناوو جێگە پەنجەیان دیارە.

گوفتارو ڕەفتاری هەر یەکەمان نیشاندەری کەسایەتیمانە، گەر ئەوەی دەیلێین‌و دەیزانین کاری پێ بکەین‌و بیخەینە بواری پراکتیکەوە ئەوا سەرکەوتن‌و بەختەوەری دەبنە مولکمان، گەر گوفتارمان شیرین‌و ڕەوانبێ‌و کردارمان کەم‌و ناتەواو، یان ڕەفتارو گوفتارمان جودابێت، ئەوە خاوەنی ژینێکی لاسەنگو کەسێتییەکی کاڵ‌و کرچین‌و نیشانەی پرسیارمان لەسەر دروست دەبێت‌و ڕێگەی بەرەوپێشچوون‌و گەشەکردنمان لە خۆمان تەنیوە، ئەوەتا غاندی دەڵێت: (کاتێك مرۆڤ هەست بە ئاسودەیی دەکات، کە بیرکردنەوەو گوفتارو ڕەفتاری هەماهەنگبن)، هەماهەنگ نەبوون‌و ناتەرازویی لە نێوان قسەو کرداردا نیشانەی ناتەواوی‌و کەموکورتی مرۆڤە! مرۆڤە کەمتەرخەم‌و بێ ئەرزش‌و پەراوێزخراوو پەرتەوازەکان ئەوانەن کە کردارو ڕەفتاریان ئاسمان‌و ڕێسمانیان فەرقە، گوفتاریان لە دۆڵێکەو ڕەفتاریان لە دۆڵێکی تر!

هەمووومان ئەگەر خوانەخواستە خۆشمان لەو جۆرە مرۆڤانە نەبین، بەلام خۆ زۆرمان ئەو مرۆڤانە بینیوەو بەرچاو کەوتووە کە گورد وتەنی بەقسە هیچیان نەهێشتووەتەوە، وەستای قسەو کوڵەواری دەستن! ئەم جۆرە لە مرۆڤ گەل بەداخەوە نرخێکیان بۆ خۆیان نەهێشتوەتەوەو هەر قسەیەك کە دەیکەن بەردێکەو ئەیگرنە سومعەو ناوبانگو کەسایەتیان، چونکە بانگەشە بۆ شتێك دەکەن کە خۆیان ئامادەنین ئەنجامی بدەن! یان شتێك ئەنجام ئەدەن کە خۆیان ڕێگریان لێکردووەو دژی وەستاونەتەوە! ئەم دژیەك بوونەش هەمیشە نیشانەی پرسیار لای هاوڕێ‌و هاوکارو دۆستەکانیان بەجێ دەهێڵێت. تا دواجار دەبنە مەخسەرەو سەنگو قورساییان لە دەست دەدەن‌و خۆشیان تووشی ئازاری ویژدانی‌و ڕۆحی‌و دەروونی دەکەن.

بۆیە پێویستە گوفتارو ڕەفتارمان هەماهەنگبن‌و کردارمان گوفتارمانبێت. هەتا بتوانین متمانەی دەروونی خۆمان‌و کەسانی تریش بەدەست بهێنین‌و خاڵی سەرکەوتن بپێکین. نەك کۆشکی ژیانمان لە سەهۆڵ دروست بکەین‌و توانای بینینی ڕووی خۆری نەبێت‌و زووبەزوو بتوێتەوەو هەرەس بهێنێت.

هەروەك مرۆڤەکانیش بە پێی کردارو ڕەفتاریان دەکرێن بە چواربەشەوە، ئەو مرۆڤەی کردارو گوفتاری جوان‌و چونیەکە، وەك شەمامەیەك وایە کە بۆن‌و تامی خۆش‌و شیرینە، ئەو مرۆڤەش تەنها وتەی جوان‌و باشی هەیە وەك ڕێحانە وایە بۆنی خۆشە، بەلام تامی تاڵە، ئەو کەسەی تەنها کرداری هەیە وەك خورما وایە هەرچەند بۆنی نەبێت تامی شیرین‌و خۆشە، ئەوەش کەکردارو گوفتاری نادروستە وەك دڕك وایەو هیچ سودێکی نیە.

جێی خۆیەتی هەمووومان هەوڵبدەین کردارو گوفتارمان یەکبخەین. باش بڵێین‌و باش جێبەجێ بکەین. ئەو شتەی لەخۆماندا نییە بە کەسانی تری نەڵێین‌و قەدەغەی کارێکیش نەکەین کە خۆمان خەریکی ئەنجامدانین، شتێك لە خەڵك دوور نەخەینەوە کە خۆمان باوەشمان پیاکردووەو لە ئامێزمان گرتووە! هەروەك دەگێڕنەوە جارێك نەخۆشێك دەبەنە خزمەت پێغەمبەر (سەلامی خوای لێبێت) تا چارەسەرێکیان پیشان بدات، ئەویش پێیان دەفەرموێت بڕۆن‌و سبەینێ بیهێننەوە. بۆ ڕۆژیی دوایی کاتێك نەخۆشەکە دەهێننەوە بۆ لای پێشەوا پێی دەفەرموێت: خورما مەخۆ، هاوەڵان لێی دەپرسن ئەی پێغەمبەری خوا خۆ دوێنێش دەتتوانی ئەوەی پێ بڵێیت؟ ئەویش دەفەرموێت: ئاخر خۆم دوێنێ خورمام دەخوارد.

ئەوە بۆ هەمومان ڕوون‌و ئاشکرایە کە وتەی بێ کردار ناتوانێت خزمەتێکمان بکات‌و بەرەو ویست‌و ئامانجەکانمان بەرێت، بۆیە ئێستا کاتی ئەوەیە ئەوەی دەیزانین بیکەینە کردار، کاتێك گوفتارمان شیرین‌و پاراوە کە لەگەڵ کردارەکانماندا سەمفۆنیایەکی هەماهەنگیان پێکهێنابێت ئەو کاتە ئاوازێك بۆ کەسایەتیمان دروست دەکەن کە هەموو کەسێك حەز بە گوێلێگرتنی دەکات‌و ڕۆحمان شادو دەروونمان ئارام‌و ژیانمان ڕەنگینتر دەبێت‌و سات بەسات بەرەو پێش دەچین‌و وزەو تواناکانمان دەخەینەگەڕو دەتوانین خزمەت بەخۆمان‌و خەڵکی بکەین.

هاروون ڕەشید

# با گوڵ بکەین بە نەریت



گوڵفرۆشێك لە شارۆچكەیەكدا دووكانێكی گوڵفرۆشی دانا، لەم شارۆچكەیەدا بۆ یەكەمجار بوو دووكانێك بۆ گوڵفرۆشتن بكرێتەوە، كابرای گوڵفرۆش بینی بۆ ماوەی هەفتەیەك زیاترە دووكانەكەی كردووەتەوە، بەڵام تاكو ئێستا هیچ كەسێك گوڵی لێ نەكڕیوە، بەم ڕووداوە زۆر سەرسام بوو، لە دڵی خۆیدا گوتی: باشە لەم شارۆچكەیەدا هیچ كەس گرنكی بە خۆشەویستانی نادات، تا دیارییەكی بۆ بكڕێت؟

لە بەرخۆیەوە گوتی: ڕەنگە ئەم حاڵەتەش بە هۆی سەرقاڵی خەڵكی شارۆچكەكەوە بێت، هەربۆیە گوڵفرۆشەكە بیری لە ڕێگە چارەیەك دەكردەوە تا سەرنجی خەڵكی بە لای دووكانەكەیدا ڕابكێشێتو گوڵی لێ بكڕن!

ڕۆژێكیان دەمەوبەیان تازە لاوێك بە بەردەم دووكانەكەدا تێپەڕی، گوڵفرۆشەكە بانگی كردو چەپكێك گوڵی بە دیاری دا بە تازە لاوەكە.

ئەویش بەسەرسوڕمانەوە بە كابرای گوڵفرۆشی گوت: بۆچی ئەم گوڵە جوانانە دەدەیت بە من؟!

گوڵفرۆشەكەش بە خەندەوە گوتی: با ئەم گوڵانە بە دیاری بۆ تۆ بێت، بۆچی مەگەر دیاری خراپە؟

لاوەكەش بە ڕوویەكی خۆشەوە گوتی: بەڕاستی نازانم چۆن سوپاسی ئەم دیارییەت بكەم!؟

پاشان لاوەكە گوڵفرۆشەكەی بەجێهێشتو بە دڵخۆشییەوە بەرەو ماڵ دەڕۆیشت، لە ڕێگەدا هەر بۆنی چەپكە گوڵەكەی دەكرد، دواتر هاوڕێیەكی بینی سڵاوی لێكردو هاوڕێكەی گوڵەكانی بینی، بۆنی گوڵەكانی كردو گوتی: بۆنی ئەم گوڵانە چەند خۆشن، لاوەكە دوو دانە لەو گوڵانەی بە دیاری بە هاوڕێكەی دا..

هاوڕێكەشی نەیدەزانی چۆن سوپاسی بكات، بەو دیارییە نایابەی زۆر دڵخۆشبوو، پاشان لاوەكە هاوڕێكەی بەجێهێشتو گەڕایەوە ماڵ، لەبەردەرگادا یەك لە دراوسێكانیانی بینی، بەیانی باشی لێكردو دراوسێكەیان پرسی: ئەو گوڵە جوانانە چین؟ هاتە پێشەوەو بۆنی گوڵەكانی كردو گوتی: بۆنیان خۆشو سەرنجڕاكێشە.

لاوەكەش دوودانە گوڵی بە دیاری دایە دراوسێكەیان، ئەویش وێڕای خۆشحاڵی زۆر سوپاسی كرد بۆ ئەو دیارییە جوانەی.

پاشان چووە ماڵەوەو گوڵەكانی دیكەی پێشكەش بە دایكی كرد، دایكیشی زۆرخۆشحاڵ بوو..

ئەو هاوڕێیەشی كە دوو گوڵەكەی پێبەخشیبوو، كاتێك گەڕایەوە ماڵەوە بینی خێزانەكەی سەرقاڵی ئامادەكردنی نانی بەیانییە، ئەویش دوو گوڵەكەی لەسەر مێزی نانخواردنەكە دانا، كاتێك هاوسەرەكەی هاتە سەرمێزی نانخواردنەكە وتی: گیانەكەم ئەم گوڵانەت بە دیاری بۆ من هێناوە؟

هاوسەرەكەشی بۆئەوەی خێزانەكەی دڵخۆش بێت بە پێكەنینەوە گوتی: بەڵێ، ئەویش زۆر شادمان بوو، كاتێك هەستی كرد كە لە دیدی هاوسەرەكەیدا جێگەی بایەخو گرنگی پێدانە.

پاش چەند ڕۆژێك خێزانەكەی دەمەوئێوارە بە ڕێكەوت بە بەردەمی دووكانی گوڵفرۆشەكەدا تێپەڕی، كاتێك چاوی بە دووكانی گوڵفرۆشەكە كەوت، لە دڵی خۆیدا گوتی: ئەو ڕۆژە هاوسەرەكەم دوو گوڵی بە دیاری بۆ من هێنا، ئەویش شایەنی ئەوەیە كە من چەپكێ گوڵی بە دیاری بۆ بكڕم، ڕۆیشتە دووكانەكەو بە گوڵ فرۆشەكەی گوت: چەپكێ گوڵم بۆ ئامادە بكە لە جوانترینو بۆنخۆشترین گوڵەكانی ئەم دووكانە.

پاش گەڕانەوەی بۆ ماڵ، چەپكە گوڵەكەی پێشكەشی هاوسەرەكەی كرد، ئەویش وێڕای خۆشحاڵی، زۆر سوپاسی هاوسەرەكەی كرد.

هەریەك لەوانی دیكەش، كە گوڵیان لە یەكتر بە دیاری وەرگرتبوو، گوڵیان بۆ ئەو كەسانە بە دیاری برد كە گوڵیان لێ وەرگرتبوون، ئیدی خەڵكی شارۆچكەكە فێربوون كە بۆ خۆشەویستەكانیان گوڵ بكڕنو بە دیاری پێشكەشی دۆستانو خۆشەویستانیان بكەن.

لەو كاتەوە دووكانی گوڵفرۆشەكە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ قەرەباڵغتر دەبوو، چونكە خەڵكی شارۆچكەكە تێگەیشتن كە بە كڕینی دیاریو گوڵ پێشكەشكردن، خۆشەویستی نێوانیان نوێ دەبێتەوەو بەهێز دەبێت، كەواتە بۆئەوەی كە خۆشەویست بیت لای كەسانی دەوروبەرت، تۆ دەستپێشخەری بكە لە دیاری كڕینو گوڵ پێشكەشكردن. پەندێكیش هەیە دەڵێت: (ئەگەر دوو دینارت پێبوو، بە یەكێكیان نانێك بكڕەو بەوی تریان گوڵ)!



ئاسۆ حاجی



# تەنها دەستپێکردن زەحمەتە

لە وڵاتەکەماندا نەهامەتی باڵی کێشابوو بەسەر هەموو شوێنێکدا، نەبوونی چووبووە ماڵی هەموو کەسێکەوە، گرانی لە نێو کۆڵانو دوکانو بازاڕەکاندا دەسوڕایەوە، زۆر بە دە گمەن کەسێکی قەڵەو گۆشتنت دەدیت، ئەگەر نا بە زۆری ڕووخساری لاوازو چرچو لۆچاوی، بێهێز، جلی شڕو پینەکراو، شارەکەمان زۆر هەژار ببوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو ساڵانە زستان زۆرسەختو ساردو دژوارو باراناویو تەمەن درێژبوو، مانگێك زوو دەستی پێدەکردو مانگێك درەنگتر تەواو دەبوو، سەرەڕای ساردیو سەختی زستان کارەباش نەبوو، نەوت زۆرکەمبوو، شەوانە دەبوو زوو بچیتە ناو جێگەی خەوەکەت، هەتا بەیان بەبێ ئاگرو بێ ڕووناکی. بێکاریش دۆستو هاوڕێی هەموو کەسێك بوو، بە تایبەتی کاسبکاران، ئەگەر بەیانیان بچوویتایەتە مەیدانی کرێکاری دەتدیت چ ژمارەیەکی کرێکار لەوێ چاوەڕێی کارن، ئەگەر بەس سلاوێکت بکردبایە، پێنجو شەش.. دەو دوانزە لە دەورت کۆدەبوونەوە بۆ ئیش، لەگەڵ ئەوەش ڕۆژانە چەندان کرێکار بە دەست بە تاڵیو دڵساردی ملی ڕێی ماڵیان دەگرتو دە گەڕانەوە نێوماڵو منداڵیان، قوتابیو مامۆستاو فەرمانبەرانیش لەم حاڵە بێبەش نەبوون، تەنانەت خراپتریش بوون، لەو بارودۆخەدا قوتابی بێ پەرتووكو بێ دەفتەرو پێنووسو بە گیرفانی بە تاڵ، شەوانەش بێ ئاگرو بێ کارەبا، لەگەڵ هەموو ئەم نەهامەتیانەدا بەردەوامبوون لە خوێندنو دانیان بە خۆدا دەگرت تا دەگەیشتنە وەرزی هاوین، وەرزی هاوین بە وەرزی هەژاران ناسرابوو. لە نێو ئەم شارەدا منیش یەکێك بووم لەوانە کە قوتابی بووم، کە هاوین دادەهات نەمدەزانی چی بکەم، کارم دەستنەدەکەوت، نەمدەزانی بە کێ بڵێم کارم بۆ بدۆزێتەوە چ کارێك بکەم؟! تا شەوێك لە دوای نوێژ لە مزگەوت دانیشتبووم، لە شوێنی خۆم داوام لە خوا دەکرد تا یارمەتیم بدات، کە هاتمەدەرێ لە بەردەم مزگەوت گوێم لە چەند کەسێك بوو پێدەکەنینو باسی فرۆشتنو قازانجو زەرەریان دەکرد، دەربارەی سەمون فرۆشتن هەردەیان وتەوە، منیش لە ناخی خۆمدا وتم ئەگەر منیش سەمون بفرۆشم چییە؟ یانی ئەگەر ئەو کارە بکەم شتێکی باشە، ئەو شەوە هەربیرم کردەوە تاسبەی، سبەینێش تاشەو، شەو بڕیارمداو باسم کرد لە ماڵەوە، وتم بەیانی دەچم بۆ سەمون فرۆشتن، ماڵەوە سەریان سوڕما زۆر لایان سەیربوو بە تایبەت دایکم، چونکە قەت ئەو کارەم نەکرد بوو لە ماڵەوەش کەس کاری وای نەکردبوو، وتم دایە گوشێكو تورەکەیەك، لەگەڵ پارەی پەنجا سەمونم بۆ دابنێ، بەیانی بە پشتیوانی خودا دەچم، ئەو شەوە هەربیرم دەکردەوە چۆن بچم لە کوێ بیهێنم؟! لە کوێ بیفرۆشم تابەیانی پێش بانگ هەڵسام بە ڕێکەوتم، ڕۆیشتم تاچومە بەردەم سەموونخانەیەك بینیم هیچ سەموون فرۆشێك لەوێ نییە، کرێکارەکانی فڕنەکەش تازە فڕنیان گەرم دەکرد، وتم خوایە ئەوە چییە کەس لێرە نییە دیارە شوێنەکەم هەڵە کردووە؟! ئەی لە کوێ سەمون بهێنم، لە ناکاو کرێکارێکیان وتی: فەرموو، منیش نەمزانی چ بڵێم وتم سڵاو ئەرێ دەڵێی ئەمڕۆ درەنگ لە خەو هەڵساون؟ سەیرێکی یەکتریات کردو وتیان نا...

بۆ؟ وتم هیچ لە چاوتروکانێکا ئەوێم بەجێهێشتو بەرەو سەموونخانەیەکی تر ڕۆیشتم کە نزیك بوومەوە بینیم ژمارەیەکی زۆر پایسکل لەوێ وەستاون کە نیشانەی سەموونفرۆش بوو، بەڵام من پایسکیلم نەبوو، لە ژوورەوەش دەنگە دەنگێکی زۆردەهات دڵنیابووم کە ئێرەیە ئەو سەموونخانەی دەمەوێت، وتم خوایەگیان سوپاس دۆزیمەوە ئێستا دەچم بەشی خۆم سەموون دێنمو هەر زوو دەیفرۆشم، قازانجێکم دەستدەکەوێتو بە دڵخۆشی دەگەڕێمەوە، ئیدی ڕۆیشتمە ژوورەوەو سڵاوم کرد، پاش سڵاو، خاوەن فڕنەکە وتی: ناوت نووسیوە؟ وتم ناونووسینی چی؟! وتی دەبێت پێشتر ناوت بنووسی تابزانم چەند سەموونت دەوێت، تا بەشی ئەوەندەی دەتەوێت هەویر بەشی تۆش بشێلمو سەموونت بۆ ئامادە بکەین، وتم من شتی وانازانم یانی نەمزانی بوو، خاوەن فڕنەکە وتی: کەواتە ئەمڕۆ سەموون بۆ تۆ نییە، بۆت نییە سەموون بەریت، چونکە بەشی تۆمان ئامادەنەکردووە دەبێت ئەمڕۆ بێ سەمون بڕۆیتەوە، منیش بێ دەنگ وەستام بیرم کردەوە بەم بەیانییە زووە لە خەو هەڵساوم بە پێ ئەو هەموو ڕێگەیەم بڕیوە، کەچی سەموونیش نەبەم... وتم خوایە ئاوا بە دەست بەتاڵی ڕەوانەم دەکەیتەوە، لە ناکاو کەسێك لە من هاتەپێشو وتی: خەم مەخۆ من لە بەشی خۆم پەنجا سەموونت دەدەمێ، منیش زۆردڵخۆشبووم وتم: خودایە زۆرسوپاس بۆ تۆ، پاشان سوپاسی ئەویشم کرد، کە نۆرەی هات لە پێشدا پەنجا سەموونی بە مندا، پاشان هی خۆی وەرگرت، من ڕۆیشتم بە پێ ئەو دوای من بە پایسکل هات، گەیشتە من وتی: بڕۆ فلانە شوێن بیفرۆشە بۆ تۆ نزیکە، کە چووم دەستم کرد بە بانگ کردن... سەموونی گەرم سەمون... هەر بانگم کرد تا ڕۆژ بە تەواوی دەرکەوتو کاتی نانخواردنی بە یانی نەما، منیش گەڕامەوەماڵەوەو دەرگام کردەوە بینیم دایکم نان دەکات چ نانێك بە دار لە ژێر دوکەڵا نەتدەدیت، هەویرێکی ڕەش نانێکی گچکەی ئەستور، لایەکی سوتاو لایەکی خاو، بەڵام هەموو کەسیش لەو سەردەمە ئەو نانەی دەستنەدەکەوت زۆرکەم بوو، منیش هاتمە لای دایکم دانیشتمو گونیەکەم لەبەردەستی دانا، وتی ئەمە چییە؟ وتم سەموونە، وتی باشە دەزانم سەموونە، بەڵام کوا چیت فرۆشتووە؟ وتم دەزانی چی دایە، زۆر گەڕام، زۆربانگم کرد، بەڵام بە خوای هیچم نەفرۆشت تەنانەت سەمونێکیش، ئێ چیبکەم کە نەفرۆشرێت، سبەی بە ویستی خودا دەچم هەر دەیفرۆشم، کەوام وت دایکم زۆرسەری سوڕما! چونکە ئەو ڕۆژە هیچم نەفرۆشتبوو، کە چی دەموت سبەی دەچم دەیفرۆشم خەمت نەبێت، بۆ بەیانی بە هەمان شێوە چوومەوە پەنجا سەموونم هێنا بردمەوە هەمان شوێن، بەڵام ئەمجارە بە ماوەیەکی زۆر کەم هەمووییم فرۆشتو تەواوم کرد، تازە کارەکەم لەلا ئاسان بووە، چونکە ڕێگا زەحمەتەکەم بڕیبوو، کە پێش دەستپێکردن زۆر زەحمەت بوو، بەڵام ئێستا نا بۆیە لەو ڕۆژەوە بەردەوامبووم تا وەرزی هاوینم تەواوکردو گەیشتینەوە وەرزی کردنەوەی قوتابخانە، زۆر دڵخۆشبووم بە کارەکەم.

کارکردن بڕیاردانی زەحمەتە، بەڵام زەحمەتی هەر کارێك تەنها دەستپێك ردنییەتی، لەو ڕۆژەوە تێگەیشتم ژیان هەر چەندە سەختو دژواربێت، بەڵام گرنگ چۆك دانەدانە بەرامبەر زەحمەتییەکانو نەهامەتیەکانو سەرنەکەوتنی یەکەمو دووەم... بێ هیوا نەبیت، چونکە لە لوتکەی تەنهاییدا دڵنیابە خودا بە تەنهات ناهێڵێتەوە، بێ هیوا مەبە داوای لێبکە، بۆیە نابێت چاوەڕێبکەیت ژیان تۆ بە جێبهێڵێت، لانی کەم ئەگەر نەتوانی پێش بکەویت، دەبێت جێنەمێنیت، چونکە زەحمەتی ژیان لە بڕیاردان بۆ ئەنجام، تەنها بڕینی بەربەستی یەکەمو جوڵەی هەنگاوی یەکەم سەختە.



## تەمەن!

لەسەرەتای تەمەنمەوە... دەمردمو دەژیامو بەردەوام هەوڵم دەدا، بۆئەوەی لە قوتابخانە سەرکەوتوو بمو لە زانکۆ وەربگیرێم..

دوای ئەوە دەمردمو دەژیامو خۆم ماندوو دەکرد، بۆئەوەی زانکۆ بە سەرکەوتوویی تەواو بکەم، تا دوای ئەوە بچمە سەر کارو بتوانم بژێوییەك پەیدا بکەمو لە گیرفانی خاڵی ڕزگارم بێت..

پاشان بەردەوام هەوڵم دەدا بۆئەوەی کەسێکی شیاوو گونجاو بدۆزمەوەو هاوسەرگیری لەگەڵدا بکەم.. تا پێکەوە بتوانین نەوەیەك بخەینەوەو ببینە خاوەنی منداڵو جگەرگۆشە...

پاشان لە چاوەڕوانیدا گیانم ئەدا تا منداڵەکانم گەورە ببنو فێرببنو کەسانێکی باشی نێو کۆمەڵگەیان لێ دەربچێتو بەسوود بن بۆ خۆیانو کۆمەڵگەکەیان..

ئێستا من دەتوانم جارێکی تر بگەڕێمەوە بۆ سەر کارەکەم...

بەڵام خەمم بۆ ئەوەیە بە مووچەیەکی باش خانەنشین ببم...

ئێستاش هەر وایە لەسەر جێگە کەوتوومو چاوەڕوانم مەرگ ببێتە میوانم...

لە ناکاودا زانیم، کە من بیرم چووە لەم دنیایەدا بژیم...

تکایە... تکایە هەر ئێستا ڕازی بە، بە بارودۆخی ژیانت، هەر چۆنێکە...

چێژ لەم ساتەوەختە وەربگرە...

هەموو ڕۆژێك بە ڕۆژی خۆت بزانە... نەخەم بۆ ڕابردوو بخۆ.. نەترسیشت لە ئایندە هەبێت، ئەمڕۆ مولکی تۆیەو بەس، دوێنێ ڕۆیشتو ناگەڕێتەوە، سبەینێش هەر خوا دەزانێت تۆ پێی دەگەیت، یان نا؟!

ئێمەی مرۆڤ هەموو ژیانو هەموو تەندروستیمان بەسەردەبەین بۆ بەدەستهێنانی ماڵو سامان...

لە پاشاندا بۆ گێڕانەوەی تەندروستیمان، هەموو ماڵەکەمان خەرج دەکەین..

لە ژیاندا دەژین، وەکو ئەوەی هەرگیز نەمرین...

کاتێکیش چرکەساتی مەرگ بەرەو ڕوومان دێت، وادەزانین تەنها ڕۆژێکیش لەم ژیانەدا نەژیاوین...

بەشی دووەم

و: لە ئینگلیزییەوە: پشتیوان موبارەك كەریم




# ٩٨ كلیل بۆ سەركەوتن

٣٦- بە تەواوی ڕای خۆت دەربڕەو بەرامبەرەكانت تێ بگەیەنە، بە هۆی ئەوەی كە هەمیشە گفتوگۆی گرانو پێویست ئەنجام بدەو دووركەوەرەوە لە ساردكردنەوەو نەهێشتنی پەیوەندییە خزمایەتییەكان بە تایبەتی لەگەڵ هاوسەرەكەتدا.

٣٧- ڕۆژ بە ڕۆژ باشتربەو هەنگاوی باشتر بنێ.

٣٨- خۆشیو شادی بڕوێنە، لە ڕێگەی خوێندنەوەی كتێبە باشەكان كە مێشكو ئاوەزت گەشە پێدەدەن. (خوێنەران سەركردن).

٣٩- خەونو ئاواتەكانت بنووسەرەوەو لە شوێنێكدا دایبنێ كە هەموو ڕۆژێك بیبینیت.

٤٠- بۆ هەر ساڵێك ئامانجێك دابنێ، تەنها یەك ئامانجی گرنگ، پاشان جێبەجێی بكەو بیگەیەنە ئەنجام. بۆ نموونە، پێشكەوتنی پەیوەندی هاوسەری، كاروباری دارایی... هتد.

٤١- ئاهەنگگێر بەو ئاستی زمانەوانی خۆت فراوان بكە.

٤٢- ڕۆژانە مەشقو ڕاهێنان ئەنجام بدە.

٤٣- ڕێزو خۆشەویستی خۆت بۆ ئەو كەسانە دەربڕە كە زۆرترین جێی مەبەستو خواستی تۆن.

٤٤- هەوڵ بدە خوای پەروەردگار بە ڕاستی بناسیت.

٤٥-خۆراكی تەندروست بخۆ، چونكە كار دەكاتە سەر تەندروستیو بیركردنەوەت.

٤٦- با هەمیشە پەیوەندی توندوتۆڵت لەگەڵ ئەندامانی خێزانەكەتدا هەبێت.

٤٧- شوێنی پەروەردەیەكی باش بكەوە، پەروەردەیەك كە شایستەی تۆ بێت.

٤٨- بەهانە دروست مەكەو هەرگیز سكاڵاش مەكە.

٤٩- كاروبارەكانت لە لیستێكدا بنوسەرەوەو لە سەرەتادا ئەوەیان جێبەجێ بكە كە لە هەموویان گرنگترە.

٥٠- چالاكییەك ئەنجام بدە كە بە درێژای ڕۆژێك، یان هەفتەیەك بەردەوام بێت.

٥١- ڕۆژانە بەردەوام بە لەسەر وەرزشو ڕاهێنانەكانتو ڕاستو دروست بڕۆ.

٥٢- لە كۆتایی هەفتەدا كاتێكی دیاریكراو تەرخان بكە بۆ وەرزشێكی تایبەت.

٥٣- با هەمیشە بڕێك پارەی پاشەكەوت كراوت هەبێت.

٥٤- با وەسیەتێكی نوسراوت هەبێت.

٥٥- لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە سەیری خەڵكی بكەو باوەڕت بە خۆت هەبێت.

٥٦- بزانە كە تۆ كەسێكی خۆشەویستیت.

٥٧- بزانە كە تۆ كەسێكی بە نرخو گرانبەهایتو شایانی باشترین سەركەوتنیت.

٥٨- پەیوەست بە بە لایەنی ڕۆحی خۆتەوە.

٥٩- بە لایەنی كەمەوە ساڵی جارێك سەردانی دكتۆرەكەت بكە.

٦٠- ئاگاداری جەستەو لەشساغیت بە.

٦١- ڕێزی دایكو باوكت بگرە.

٦٢- ژیانو بەسەرهاتی خەڵكانی سەركەوتوو بخوێنەرەوە.

٦٣- هەوڵ و كۆششت لە بواری كارەكەتدا هەڵسەنگێنەو بە وردی بیری لێبكەرەوە.

٦٤-با خەونو ئاواتی مەزنت هەبێت.

٦٥- لە كانییەك ئاوت خواردەوە بەردی تێ فڕێ مەدە.

هەرووەك

# هەزاران مرۆڤی تر سەرکەوتوو بە



و.ئوسامە محەممەد

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: هەرگیز سەیری نیوە خاڵییەکەی پەرداخ ناکەن، ئەوان دەچنە ناو دڵی کێشەکانەوەو بە خەیاڵی سەرکەوتنەوە هەنگاو دەنێن، هەر گیز بە خەیاڵیش بیر لە شکست ناکانەوەو ئەم دەستەواژەیە لای ئەوان هیچ مانایەکی نییە.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: بەهێزو چالاکن‌و بە ئیرادەی بەهێز، تا گەیشتن بە ئامانجەکانیان واز لە هەوڵدان ناهێنن.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: ئەوەندە بڕوایان بە خۆیان هەیە، تا ئەو ڕادەیەی کە هەندێ کات خەڵکی دەڵێن: کە ئەوان کەسێکی خۆپەسەندو خۆبەزلزانن، بەڵام ئەم هەڵسوکەوتانەی ئەوان هەمووی لە بڕوا بە خۆبوونی زۆرەوە سەرچاوە دەگرێت.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: لە هیچ شتێك ناترسن‌و بە ئازایەتی دەچنە پێشەوە، سوود لەشتەکان وەردەگرن‌و لە ڕووداوەکانی ڕێگادا بێباکن.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: باوەڕێکی پتەویان بە پەروەردگاریان هەیە، بڕوایان وایە کە پەروەردگار توانای پێ دەبەخشێت بۆ گەیشتن بەو شتانەی کە دەیانەوێت، بە هۆی ئەو باوەڕە پتەوەی هەیانە لە ژێر سێبەری دەسەڵاتی پەروەردگاردا هەنگاو دەنێن.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: هەرگیز نائومێد نابن‌و وشەی نائومێدیو ڕەشبینی‌و تەسلیم بوون بۆ ئەوان بێمانایە، ئەوان بە وزەی ئومێد ئەژین‌و بە چاوێکی ئومێدەوارانە سەیری شتەکان دەکەن.

*مرۆڤە سەرکەوتووەکان: خۆشەویستی هەموو خەڵکن، لەبەرئەوەی یارمەتی هەموو خەڵکی دەدەن، بۆیە خەڵکیش لە ڕۆژگارە سەختەکاندا یارمەتی ئەوان دەدەن.

* مرۆڤەسەرکەوتووەکان: مرۆڤێکی میهرەبان‌و بەخشندەن، ئەوان بە هۆی سەرکەوتنیان هەمیشە شادو دڵخۆشن، بوونیان لە هەر کۆمەڵێکدا دەبێتە هۆی دڵخۆشی هەموویان، ئەوان مرۆڤێکی دڵگیروخۆشەویستن.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: کەسانێکی ئارامگرن، هەرگیز توڕەنابن، لەگەڵ کێشەکاندا ژیرانە مامەڵە دەکەن‌و بۆ چارەسەریان باشترین‌و گونجاوترین ڕێگا هەڵدەبژێرن.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: هیچ کات بەبێ بەرنامە هەنگاونانێن‌و ژیانی خۆیان زۆر بە باشی ڕێك دەخەن.

* مرۆڤە سەرکەوتوەکان: لە ئەنجامدانی هەر کارێك بە باشی بیری لێ دەکەنەوەو هەرگیز بەبێ شارەزایی ناچنە ناو ئاوەوە، هەڵەشانە بڕیار نادەن.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: گرنگی دەدەن بە سەلامەتی جەستەو ڕۆحی خۆیان، ئەوان بە ئەندازەی پێویست خۆراك دەخۆن‌و بە ئەندازەی پێویست دەخەون‌و وەرزش فەرامۆش ناکەن.

* مرۆڤەسەرکەوتووەکان: هەرگیز بۆ ڕابردوو ئەفسوس ناخۆن، بەڵکو لە ڕووداوەکان پەند وەردەگرن‌و ئەزموون فێردەبن، ئەوان هەرگیز نیگەرانی ئایندە نین، چونکە بڕوایان بە تواناکانی خۆیان هەیە.

* مرۆڤە سەرکەوتووەکان: هیچ کاتێك گلەیی لە نەبوونی خۆیان ناکەن، ناسوپاسگوزاری لە فەرهەنگی ئەواندا نییە، بەو شتانەی کە هەیانە ڕازیو قانیعن، بۆ بە دەستهێنانی ئەو شتانەی کە نیانە دەیانەوێت دەستیان کەوێت، هەمیشە بڕوابەخۆبوونی تەواویان هەیەو هەوڵ دەدەن.

چیا عەبدوڵا

# نیعمەتەکانی کرێچێتی

ڕەنگە ناونیشانی بابەتەکەت بەلاوە سەیر بێت، بەڵام هەموو شتێك لەم جیهانەدا لایەنی چاکی هەیەو خراپیشی هەیە، گەر تەنیا سەیری یەك لایەنی بابەتەکان بکەیت، یا ڕەشبینیو بێ هیواییەکی تەواومان بۆ دروست دەبێت، یاخود گەشبینییەکی هەڵخەڵەتێنەر، واباشترە لەو نێوەندەدا هەڵوێستەیەك بکەین، تۆش بڕیاردەری کە کام لایەن لەم دوانە هەڵدەبژێریت، کرێچێتیش یەکێکە لەو جۆرە ژیانەی کە دەتوانم بڵێم لە ٧٠٪ی گەنجی ئەم سەردەمە تیایدا دەژین، لای هەرکەسێك بڵێیت کرێچیم بەنیگایەکی بەزەیی ئامێزەوە بۆت دەڕوانێت، دوای ئەم زمانی جەستەیە بەدەمیش دەڵێت وەیش ش ش ش، زۆر سەختە لەگەڵ بەزەی هاتنەوەی ئەودا، خۆشت بەزەییت بە خۆتدا نەیەتەوە، بەڵام چۆك دامەدەو زویر مەبە ئەو چەندە باسی نەرێنی ژیانی کرێچێتی خۆیت بۆ بکات، منیش ئەوەندە نیعمەتەکانت بۆ دەژمێرم:

١- گەر بتەوێت بچیتە نێو ژیانی هاوسەردارییەوەو خێزان پێکبهێنیت، چ کوڕ، یان کچ، بیتو نەتەوێت بچیتە سەر ماڵ، ئەوا ئەو خانووە نیعمەتەت دەست دەکەوێت کەپێی دەڵێن: کرێ، بیری لێ بکەرەوە گەر خانووی کرێ نەبوایە ئەوا نەتدەتوانی کارێکی ئاوا گرنگ ئەنجام بدەیت و نیوەی دینەکەت تەواو بکەیت.

٢- گەر بتەوێت لە ماڵی باوکت جیابیتەوەو ماڵێکی تایبەت بە خۆت هەبێتو جۆری پەروەردەی تایبەت بە خۆت هەبێت بۆ منداڵەکانت، ئەوا نیعمەتی کرێچێتی هەیە، ئەی ئەگەر نەبوایە ئەوا هەتاهەتایە هەر کوڕی دایەو بابە دەبوویت.

٣- لە ماوەی سەرەتای تەمەنی هاوسەریتدا گەر (١٠- ١٥)ساڵیش بێت ئەوا (١٠ - ١٥) خانوو دەکەیت، واتە زووزوو هەوارت دەگۆڕیت، تەنیا لە ماڵێکی مومیلدا نامێنیتەوە، بەبێ ئەوەی هیچ گۆڕانکارییەکی تیا دروست ببێت، بیری لێ بکەرەوە ئەگەر ئەو نیعمەتە نەبوایە ئەوا دەبوویتە دیلی چوار دیوارێك کە ڕەنگە هەر لەسەرەتاوە بە دڵت نەبووبێت.

٤- هەندێجار خانووی وابچکۆلە دەگریت بە کرێ، کە ئەم خانووە وات لێدەکات بڕیارو هەنگاوی چارەنووسساز بدەیت. چۆن؟

- وات لێدەکات کارەکەت بەجدی تر بکەیت، بۆئەوەی پارەی زیاتر بەدەست بهێنیتو خانوویەکی گەورە تر بگریت، دەبینی لە دواییدا ئەم خانووە بچووکە بووە بە خێرو بەرەکەت بۆت..

٥- شڕوشیتاڵت لێ کۆنابێتەوە، وەك زۆرینەی ماڵەکان، چۆن؟

لە کاتی ماڵ گواستنەوەدا هاوسەرەکەت دەستێکی پاكو جوان دێنێت بە ماڵدا، ئەوەی لەو ماوەیەدا چۆتە ژێر بەرە دێتەوە سەر بەرە، لەبەرئەوە ماڵێکی پاكو پوختو نوێت دەبێت.

٦- نیعمەتێکی دیکەی کرێچێتی ئەوەیە کە هەموو گەڕەکەکانی شارەکەت بەسەر دەکەیتەوە، هیچ شوێنێك نامێنێت بە تۆ نامۆ بێت، چونکە باری کۆمەڵایەتی هەر گەڕەکێك لەوانی تر جیاوازە، کەواتە تۆ ڕۆشنبیرییەکی تایبەتیت دەبێت لەسەر جۆری شوێنەکانو مامەڵەی کەسەکانو ناسینی خەڵکی زیاترو بوون بە هاوڕێو دراوسێی کەسی جیاواز..

٧- فێری ئەوە دەبیت چۆن نەخشە بۆ خانوی خۆت دابنێیت، چۆن؟

کاتێك دەچیتە هەر خانویەکەوەو ماوەیەك تیایدا دەژیت باشییەکانو کەموکوڕییەکانی نەخشەی ئەو خانووە دەزانیت لە سادەترین شتیەوە تاگەورەترین شتی، لەبەرئەوە دوای (١٠، یا ١٥) ساڵ لە کرێچێتی تۆ دەبیتە خاوەنی خانووی خۆت بە پشتیوانی خودا، بەڵام خانوویەکی زۆر خۆشو جیاواز. نیمچە ئەندازیارێکیشت لێ دەردەچێت.

٨- لەگەڵ خاوەن ماڵی مامەڵە قورسدا مامەڵە دەکەیت، بەلوعەکانت لێ دەگرێتەوە، دەرگات لێ دادەخات لە منداڵەکانت توڕە دەبێت، بەڵام فێری وانەیەکی زۆر گرنگ دەبیت، ئەویش ئارامگرتن، لێبوردەیی، ئەمانەش دەبنە ئەزمونێکی زۆرباش بۆ جۆری هونەری مامەڵەی تۆ، دوای ڕۆیشتنت لە هەموو شوێنێك خاوەن ماڵەکەت دەست بەسنگەوە دەگرێت بۆت، بۆ ئەو ڕەفتارە بەرزانەی تۆ، بەمەش لە هەر شوێنێك پرسیارت لە بارەوە کرا شاهێدی باشت زۆرە، دەزانیت چی تریش؟ کاتێکیش تۆ بوویت بەخاوەن ماڵ ئەو هەڵانەی ئەوان دووبارە ناکەیتەوە، کەواتە تۆ جیاوازیت، چەند خۆشە جیاواز بیت جیاوازییەکی نمونەیی.

٩- فێری خواردن گۆڕینەوە دەبیت، جاری واهەیە حەزت لە خواردنێکە، یا منداڵەکانت داوات لێ دەکەن، بەڵام ئەو کاتە لە ماڵی ئێوەدا ئەو خواردنە نییە؟ بەڵام خاوەن ماڵەکەت بەسینییەکەوە لە دەرگا دەدات ڕێك وەکو ئەوە وایە خوا لە ئاسمانەوە بە تایبەتی بۆی ناردبێت؟ بە پێچەوانەشەوە هەر وایە بۆ خاوەن ماڵەکەت کاتێك تۆ ئەو کارە ئەنجام بدەیت، بەمەش دەبیتە مرۆڤێکی بەخشندەو دڵی خەڵکی خۆش دەکەیت.

١٠- قودرەتی ئیلاهی دەبینی لەوەی خوا پەکی کەس ناخات، هەمیشە خانوویەکی کرێ بۆ تۆ هەیەو دیاریکراوە، کاتێك ئەو ئیزنت دەدات، خودا دەرگای خانوویەکی ترت بە ڕوودا دەکاتەوە.. کەواتە هیچ خەمت نییە لە ڕووی ئیمانەوە تاسەر هەبێت ڕزقیش هەیە...



# ژیان و هەڵەکانی گۆڕانکاری

دیمەن حەیدەر



چەند ساڵێك پێش ئێستا، لە باخچەیەکی ئاژەڵانی ئەمریکادا.. ورچێکیان زیندانی کردبوو. لە قەفەسێکدا کە درێژییەکەی ٣٠ پێ بوو، ئەو هەموو ڕۆژێك لەم قەفەسەدا خەریکی هاتن و ڕۆیشتن بوو، هەتا خاوەن باخچەکە توانی پارچە زەوییەك بکڕێت و شوێنێکی دەورەدراو بۆ ورچەکە دابین بکات، لە پارچە زەوییەکەدا کۆمەڵێکی زۆر درەخت و هەندێك تاشە بەردو فوارەیەکی ئاوی تێدا بوو.. سەرەنجام کاتی دیاریکراو گەیشت و ورچەکە گواسترایەوە بۆ ئەو شوێنەو دەرگاکانی قەفەسەکە کرایەوەو ورچە ڕەوانەی دنیای تازەی خۆی کرا، بەڵام چی ڕووی دا؟ ئایا ورچەکە ئەو تەمەنەی کە مابووی، لەم شوێنە نوێیەدا لە شادی و خۆشیدا بردیە سەر؟ لەو ئازادییە تازەیەی کە بە دەستی هێنا خۆشحاڵ بوو؟ بە داخەوە نەخێر.. هەرچەندە ئەو لە ناوچەیەکی کراوەدا دەژیا، ڕێك ئەوەندە هەنگاوی دەنا کە لە قەفەسەکەیدا دەیناو ئەم کارەی تا سەرەمەرگی لەسەری بەردەوامبوو.

مرۆڤیش وەك ورچ زۆر زوو فێر دەبێت کە لەگەڵ سنوورداریيەکاندا ڕابێت و وای بۆ دەچێت ئەو سنورانەی لە مێشکی خۆیدا ديناوە ببەزێنێت.. ڕووبەڕووی مەترسی دەبێتەوە. لە ڕاستیدا گۆڕانکاری لە ژیاندا بەدی نایەت.. تا ئەو کاتەی خۆمان نەمانەوێت گۆڕانکاری دروست بکەین، بنچینەی گۆڕانکاری لە ژیانی هەریەکەماندا، بە دانانی ئامانجەکان و هەوڵدان بۆ بەدی هێنانیان بەستراوەتەوە. واتە خستنەگەڕی توانای تەواوەتیمان بۆ ئەم مەبەستە. بەم پێیە گۆڕانکاری بە بێ بوونی ئامانج لە ژیاندا ڕوونادات. پێویستە ئامانجمان دیاری بکەین و دواتر بە هەوڵدان بۆ بەدیهێنانیان گۆڕانکاری لە ژیانماندا بەرجەستە بکەین. ترس هۆکاری سەرەکی ڕوونەدانی گۆڕانکارییە لە ژیانی هەریەکەماندا..

ئەمەش هۆکارێك بووە بۆ چەقبەستنی زۆربەی گەنجان لە کارێکی دیاریکراوداو دروستکردنی هێڵێکی ئەستوور بە دەوری ژیانیدا.. کە ئەمەش تواناکانمان بۆ دروستکردنی گۆڕانکاری تەسك دەکاتەوەو لە بازنەیەکی داخراودا دەیهێڵێتەوە.. متمانەو باوەڕ بە خۆبوونمان بنەمای سەرەکییە لە ڕوودان و دروستکردنی گۆڕانکاری.. لە هەموو ئەمانە گرنگتر، پشتبەستنمانە بە خوای خۆمان.. پێش بڕیاردان بە دەستپێکردنی هەر کارێك بۆ گۆڕانکاری.. چونکە ئەو خۆی بەڵێنی سەرخستنمانی داوە.. ئەگەر پشتی پێ ببەستین. لەوانەیە گەورەترین هەڵە کە گیرۆدەی دەبین و ببێتە هۆی دروستکردنی کۆمەڵێك سنورداری لە بەردەم گۆڕانکارییەکانماندا.. ئەوە بێت کە دادەنیشین تا بە تەواوی لە بارەی بابەتێکەوە دڵنیا دەبین.. پاشان دەست پێ دەکەین.. بەڵام زۆرێك لەوانەی کە توانیویانە لە ژیانیاندا، بە ئامانجی گەورەیان بگەن.. ئەوە بووە کە بەردەوام دەستیان بۆ کارێك بردووە.. کە هێشتا دڵنیا نەبوون لەو کارە کە ئایا لە توانایاندا هەیە، ئەنجامی بدەن، یان نا؟

پێویستە ئەوە بزانین کە ئامادەبوونی تەواوەتی پێشوەخت بۆ هیچ کارێك نایەتە دی.. بەڵکو کارکردن بۆ گۆڕانکاری، تەنها بریتییە لە دەستپێکردن پاشان ڕاهاتن لەسەر ئەو کارە بە ڕەچاوکردنی خستنەگەڕی توانای تەواوەتیمان.

سەرچاوە.. چیرۆکەکە لە کتێبی باوەڕبەخۆبوون بەشێوەیەکی کاریگەر. پۆل مەکنا. وەرگیراوە.

یوسف واژەیی

# ئەتەکێتی سەفەری دنیا

ئیبن عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: پێغەمبەر (درودی خوای لەسەربێت) بە دەستەکانی شانی گرتم و فەرمووی {لە دنیادا وەك نامۆیەك، یان ڕێبوارێك بژی}!

ئاشکرایە کە ڕێبوار، یان نامۆ بەو کەسە دەوترێت کە لە ماڵی، یان نیشتیمان و زێدی خۆی بەرەو ماڵێکی تر، یان شارو وڵاتێکی تر دەڕواتو مانەوەی لەو شوێنە بۆ ماوەیەکی دیاریکراو، یان دیاری نەکراو، پاشان گەڕانەوەی بۆ ئەو نیشتمانەی کە لێوەی دەرچووە.

ئەگەر ئەم جۆرە گەشتەیان ناو بنێین گەشتەبچووکەکان، یان گەشتەکورتەکانی دنیا، ئەوا گەشتێکی گەورەو دوورودرێژیشمان لەبەرە کە ئەمەی دووەمیان جیاوازی لەگەڵ یەکەم ئەوەیە:

أ- گەشتە گەورەکە ناچارین دەبێت هەربڕۆین و ویستی خۆمانی تێدا نییە.

ب- ئەم گەشتە دواگەشتەو کۆتایی بە خۆی و هەموو گەشتەکانی تر دەهێنێت.

ج- ئەم گەشتە هەموو گەشتەکانی تری لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە.

جا ئەی ئەو کەسەی کە گەشتیاری، ئایا بۆ ئەم گەشتەت هیچ پلان و بەرنامەیەکت هەیە، تا گەشتەکەت سوودمەندو سەلامەت تەواو بکەیت؟ ئەگەر نا ئەوا بە تەنیایی و بە هەستێکی قووڵەوە گوێ بگرە لەم چەند خاڵە:

یەکەم/ ڕێبوار دەبێتە میوانی ئەو شوێنەی ڕووی تێدەکات. بۆیە پێویستە لەسەری ڕێزی شوێن و خاوەن شوێن بگرێت. بۆنەوەی خاوەن شوێنەکەش ڕێزی لێبگرێت.

لەم گەشتەدا دیارەو گومانی تێدانییە خاوەن ماڵ ڕێزی تەواوی لە تۆی میوان گرتووە، ئەگەر تۆ ڕێزی خاوەن ماڵت گرتبێت، یان نا، بەوەی کە:

أ- سفرەی نیعمەتە جۆراوجۆرەکانی بێکەم وکووڕی و بە زیادەوە ڕاخستووە، هەتا تۆ لێی بەهرەمەند بیت.

ب- {عەقڵ - ژیری}پێبەخشیویت، هەتاسوودو زیانەکانی ناو کایەی ئەم ژیانەی پێ جیابکەیتەوەو {ئیرادە ویست}ی پێداوی بۆ توانای خۆگونجاندن و پتەوکردنی شوێن پێی هەنگاوەکانت، سەرەڕای ئەوەی کە مەشخەڵی پەیامێکیشی لە دەست ناوی تاتاریکییەکانی ئەم گەشتەتی پێ ڕووناك بکەیتەوەو نەخشەیەکی بۆ دیاریکردنی بەرزی و نزمی ڕێگا پێداویت...

ئەوە ڕێزی خاوەن ماڵ... ڕێزی تۆی میوانیش ئەوەیە بە خواستی ئەو هەڵسووکەوت بکەیتو ئەو کارانەی ئەو پێی ناخۆشە ئەنجامی نەدەیتو سوپاسی خزمەتگوزاریەکانیشی بکەیت. هەروەها ژینگەو شوێنەکەی بپارێزی و ڕێزی میوانانی تری هاوسەفەریشت بگریت.

دووەم/ گەشتیار دەچێتە هەرشوێنێك دەبێت ڕەچاوی یاساو ڕێساکانی ئەو شوێنە، یان داب و نەریتی ئەو ماڵە بکاتو واز لە هەڵسووکەوتی تایبەتی و هەمیشەیی خۆی بهێنێت. پێویستە تۆش لەم ماڵە گەورەدا واز لە حەزو ئارەزووە نەخوازراوەکانی ناخت بهێنی و بە پێی ڕێساکانی بڕۆیتو یاساشکێنی نەکەیت.

سێیەم/ هەموو گەشتیارێك مەبەستێك لە گەشتو سەفەرەکەیدا هەیە. تۆش پێویستە ئامانجی گەشتەکەت بزانیتو هەوڵ بدەیت هەنگاوەکانت لە خزمەتی ئەو ئامانجەدا بێت.

چوارەم/ ڕێبوار بە پێی دوورونزیکی گەشتەکەی توێشووی بۆ ئامادە دەکات، ناکرێت بۆ ئەم گەشتە تووڵانیەت توێشەبەرەت خاڵی بێت، کە ئەم گەشتە جگە لە ڕۆژگارەکان شەوگاری تاریکشی تێدایە.

برا فیکری چرا کبریتی فرسەت تا لە دەست دایە..

شەوی یەڵدا لە پێشە ڕۆژی عومرت وەختە ئاوابێ. مەحوی

توێشوش لە ڕووی چەندێتیو چۆنیەتییەوە گرنگە، (وتزودوا فان خیرالزاد التقوی).

پێنجەم- ئەوەی بۆ گەشتێك خۆی ئامادە دەکات. هەڵبەت جلوبەرگێکی تایبەتو خاوێنیش دەپۆشێت، تا گەشتێکی پۆشتەو ڕازاوە بێت. پێویستە بۆ گەشتە گەورەکەش بەرگێکی شایستە بە خۆی ئامادەکەیت، تا لە تینو تەوژمی گەرمیو ساردی ڕێگە بتپارێزێت، بەرگێ کە بەرگەی سەختیو هەڵدێرو هەڵمووتی ژیان بگرێت.

شەشەم- گەشتیار لە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشتەکەیدا وچان دەگرێتو پشوو دەدات بۆئەوەی تۆزو ئارەقو هیلاکی لە خۆی دەرکات. پێویستە لە سەفەرە مەزنەکەشدا وێستگەت هەبێتو هەڵوێستی تیا بگریت، تا تەپوتۆزی قۆناغی ڕابردوو بتەکێنیو گوڕوتەوژمێك بۆ دواتر بەخۆ بدەیت.

حەوتەم- ڕێبواربە دوورکەوتنەوە لە نیشتمانی خۆی هەنگاو بە هەنگاو هەست بە غوربەت دەکات، لە گەڕانەوەشدا خۆشیو ئاسوودەیی. ئایا تۆ لە گەڕانەوەی ئەم گەشتەتدا هێواش هێواش هەست بە دڵخۆشی و کامەرانی دەکەیت، بە نزیك بوونەوەت لە دۆست؟؟!

هەشتەم- پێشینان وتویانە: {مایەی سەفەر سەلامەتیە} هەڵبەت سەلامەتی سەروماڵ، بەڵام لە سەفەرە جاویدانیەکەتدا لەوانەیە سەروماڵ سەلامەت نەبن، {لەوێدا مایەی سەفەرسەلامەتی دڵ}ە بۆسەرەنجامێکی سەرفراز (یوم لاینفع مال ولا بنون الا من اتی الله بقلب سلیم).



# منداڵێك هەموو سامانەكەی بۆ كڕینی تابلۆیەك دەدات

و: لە تورکییەوە: ئیمان ناصح

منداڵێکی تەمەن حەوتساڵان چاوەکانی بە دیقەتەوە بەناو پێشانگای وێنەکەدا دەگێڕا، یەکێك لە وێنەکان زۆر سەرنجی ڕاکێشا بۆ ماوەیەك چووە بەردەمی وەستاو تەماشای کرد، پاشان چووە لای خاوەنی پێشانگاکەو پێی وت: کە دەیەوێت ئەو وێنەیەی پێ بفرۆشێت.

دەغیلەکەی دەستی نیشان داو وتی: هەموو پارەکانی ناو دەغیلەکەم ئەدەم بەس ئەو وێنەیەم پێ بفرۆشە!

سەرەتا خاوەنی پێشانگاکە لەبەر پێکەنین بە زۆر خۆی ڕاگرتبوو، تا پێنەکەنێو منداڵەکە زیز نەکات، بەڵام بۆی دەرکەوت کە منداڵەکە بەڕاستی قسە دەکات، هەر بۆیە ئەویش ویستی کە بەڕاستی مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

بە خۆ بەزلزانییەکەوە وتی: پیاوە بچکۆلە تۆ نازانی کە ئەم وێنە هی یەکێکە لە وێنەکێشە بەناوبانگەکانی شارەکەمان؟

منداڵەکە وتی: من وێنەکێشەکە ناناسم، بەڵام وێنەکەم زۆر بە دڵە، هەفتەی ئایندە یادی لە دایکبوونی براکەمە دەمەوێت بە دیاری بۆی ببەم!

خاوەن پێشانگا هەروەك ئەوەی کە لەگەڵ بازرگانێکدا قسە بکات وتی: گەر ئیزن بدەیت من پەیوەندی دەکەم بە وێنەکێشەکەوەو داواکارییەکەی تۆی پێ دەگەیەنم.

خاوەن پێشانگا پاش تۆزێك پەیوەندی کرد بە وێنەکێشەکەوەو باسەکەی پێگەیاند، وێنەکێشەکە بێ وەستان وتی: ئەو پارەیەی کە منداڵەکە دەیدات بە وێنەکە لێی وەربگرنو وێنەکەشی بۆ بکەنە ناو پاکەتێكو پێی بدەن!

خاوەن پێشانگاکە تەواو سەری سوڕما بوو، هەستیکرد کە ئەمە یارییەکە یانی وێنەکێشێکی بەناو بانگ دەیەوێت وێنەیەکی خۆی بە چەند فرانکێ بفرۆشێت! هەر بۆیە بە نیگارکێشەکەی وت: مامۆستا لەوانەیە من باش ئێوەم تێنەگەیاندبێت، ئەو پارەیەی کە لە نێو دەغیلەی منداڵەکەدایە لەوانەیە نەگاتە ١٠ فرانکیش، ڕەنگە هەڵە لەیەك تێگەشتنێك ڕوویدابێت، من ئەم بەرپرسیارییە ناگرمە ئەستۆ.

وێنەکێشی بەناوبانگ بە دەنگێکی دڵنیاییو هێمنییەوە وتی:

نا هیچ شتێکی بە هەڵە لێکگەیشتن نییە، هەموو پارەی دەغیلەی منداڵەکە وەربگرنو وێنەکەشی بۆ بخەنە پاکەتێكو بۆی حازربکەنو بیدەنێ، پاشان قسەکانی بەم شێوەیە تەواو کرد: دەتوانم سەدەها کەس بدۆزمەوە کە هەزارەها دۆلار بە وێنەکەم بدەن، بەڵام ناتوانم کەسێکی تر بدۆزمەوە کە تەواوی سامانەکەی خۆی پێ بدات..

سەرچاوە/کتێبی: Basari oykuler/ نووسەر: مورات چیفت کایا

و: ئەمیر ئەحمەد عەبدولقادر

# 1 تەنها خولەكێك!!

له بەردەم پەنجەرەی بڕینی بلیتی سەفەركردن بە پاس وەستابووم، دەڕۆیشتم بۆ شارێك كە ٣٣٠كم له شارەكەی خۆمەوە دوور بوو، لە بەردەممدا ئافرەتێكی تەمەن ٦٠ساڵی وەستابوو، كە گەیشتە بەردەم پەنجەرە بۆ بڕینی بلیت، گفتوگۆكردنی درێژەی كێشا لەگەڵ كارمەندەكە، لە كۆتاییدا كارمەندەكە پێی گوت: خەڵك چاوەڕێییە بە یارمەتیت كەمێك دووركەوە لای پەنجەرەكە، ئافرەتەكەش هەنگاوێك دووركەوتەوە بۆ ئەوەی ڕێگا بۆ خەڵكی تر بكاتەوە، پێش ئەوەی بلیتی خۆم ببڕم پرسیارم لە كارمەندەكە كرد كە كێشە چییە، وتی: ئەو ئافرەتە تەنها پارەی بڕینی بلیتی پێیە، پارەی چوونە ژوورەوەی وێستگەی پێ نییە كە تەنها یەك یۆرۆیە، دەیەوێت چاوەڕێی پاسەكە بكات لە دەرەوەی وێستگەكە، ئەمەش قەدەغەیە. منیش وتم: ئەمە یۆرۆیەك تكایە بلیتەكەی بۆ ببڕە. كەمێك گەڕامە دواوەو ڕێگام بۆ ئافرەتەكە كردەوە بۆئەوەی بگەڕێتە ناوڕیزەكە، دوای ئەوەی كارمەندەكە بانگی كرد. ئافرەتەكە بلیتەكەی بڕیو له تەنیشت ڕێگاكە وەستا، وەكو ئەوەی چاوەڕێی من بكات، گومانم بۆئەوە چوو كە بیەوێت سوپاسم بكات، بەڵام وای نەكرد، بەڵكو چاوەڕێی ئەوەی كرد بۆئەوەی دڵنیا بێت كە ئایا منیش بلیتەكەی خۆم دەبڕمو ڕێبكەم بەرەوشوێنی پاسەكان بۆ ڕۆیشتن، كاتێك گەیشتمە لای بە ئاماژە فەرمانی پێكردم كە جانتاكەی هەڵبگرم. كارێكی لەم شێوەیە بە لای ئەو خەڵكانەی بە بەرامبەر كاردەكەن شتێكی زۆر سەیرە. بەبێ بیركردنەوە جانتاكەیم هەڵگرتو بە یەكەوە بەرەو پاسەكە بە ڕێ كەوتین، ئەمەش شتێكی ئاساییە كە كورسییەكانمان لە تەنیشت یەكەوەیە، چونكە ئەو پێش من بلیتی بڕیوە. هەوڵمدا لای پەنجەرەكە دابنیشم بۆ ئەوەی چاو لە دیمەنی بەفربارین بكەم كە تازە دەستی پێكردبوو، بڕیاری دا بوو هەموو شتێكو ڕەنگێكی سروشت دابپۆشێت، بەو بێدەنگییە ئاگاداركەرەوە گەورەییەی: من هاتووم خێروخۆشیم بۆ هێناون، بۆیە هەرمنیش ئێستا شایستەی فەرمانڕەوایم: بەڵام ئافرەتەكە ڕێگای پێنەدامو خۆی لای پەنجەرەكە دانیشت، بێ ئەوەی یەك وشەش بڵێت!

بڕیارم دا تەماشای پێش خۆم بكەمو هیچ گرنگییەكی پێنەدەم، بەڵام هەستم كرد ئەو ئاوڕی لێ دامەوەو سەرنجی دەمو چاوی دەدام، ئەم تەماشاكردنەی بەردەوام بوو بێئەوەی یەك وشەش بڵێت، منیش هەر تەماشای بەردەمی خۆمم دەكرد، هەتاوام لێهات هەستم بە بێتاقەتی دەكرد لە تەماشاكردنەكەی كە نەم دەبینی، بەڵام هەستم پێ دەكرد، بۆیە ئاوڕم بە لای ئەودا دایەوە.

لەو كاتەدا ئافرەتەكە بە پێكەنینەوە وتی: دەمویست توانای خۆڕاگریو ئارامگرتنت تاقی بكەمەوە.

وتم: ئارامگرتن لەسەرچی؟ ئافرەتەكە وتی: لەسەر كەم ڕەوشتی، دەزانم بیرت لە چی دەكردەوە. وتم: باوەڕناكەم بزانیت، گرنگیش نییە لام كە بزانیت.

ئافرەتەكە وتی: باشە دواترپێت دەڵێم، بەڵام ئێستا سەرقاڵم كە چۆن ئەم قەرزەت بۆ بگێڕمەوە.

وتم: كارەكە وا گرنگ نییە، خۆتی پێوە سەرقاڵ مەكە.

ئافرەتەكە وتی: شتێكم لایە دەیفرۆشمو قەرزەكەت دەدەمەوە كە یۆرۆیەكە، ئایا لێم دەكڕیت، یان بە

کەسێکی تری بفرۆشم؟

وتم: ئایا دەتەوێت لێت بکڕم پێش ئەوەی بزانم چیە؟

ئافرەتەکە وتی: ئەوشتە (دانایە)، یەك یۆرۆم بدەیە بۆ ئەوەی (داناییەکەت) بدەمێ.

وتم: ئایا یۆرۆیەکەم دەدەیتەوە ئەگەر(داناییەکەم) بە دڵ نەبوو؟

ئافرەتەکە وتی: نەخێر، چونکە قسە کە کردت ناتوانی بیگێڕیتەوە، هەروەها پێویستم بە یۆرۆیەکە بۆئەوەی قەرزەکەمی پێ بدەمەوە. یۆرۆیەکم لە گیرفانم دەرهێناو سەرنجی گۆڕانکارییەکانی ڕۆخساریم دەدا، تاکو ئێستاش چاوەکانی جوانییەکانیان لە دەست نەداوە، وەکو ئەوەی لە هەرەتی لاویدا بێت، لووتە باریکەکەی لەگەڵ چاوەکانیدا دەنگوباسی زەیرەکی ڕێویانەیت پێ دەڵێن، ڕووخساری وای پێوە دیارە کە ئافرەتێکی ڕۆشنبیرە، بەڵام من هیچ پرسیارێکم لەو بارەوە لێ نەکردبوو، من گومانم لەوە دانەبوو کە باسی خۆیم بۆ دەکات، سەفەرەکەمان تاکو ئێستا لە ناوەڕاستدا بوو. بە وەرگرتنی یۆرۆکە دەستی داخست، وەکو منداڵێکی بچووك دڵخۆشبوو بە وەرگرتنی یۆرۆکەو وتی: من ئێستا خانەنشینم، پێشتر مامۆستای فەلسەفە بووم، لە شارەکەی خۆم هاتم بۆئەوەی هاوڕێیەتی برادەرێکم بکەم بۆ فرۆکەخانە، هەرچی پارەیەکم پێبوو خەرجمکرد ، تەنها بەشی پێداویستی گەڕانەوەم هێشتەوە بۆ شارەکەی خۆم، بەڵام شۆفێری تەکسی زۆرنیگەرانی کردم، یۆرۆیەکی زیادی لێ وەرگرتم، بۆیە لە دڵی خۆمدا وتم چاوەڕوانی پاس دەکەم لە دەرەوەی وێستگە، نەمزانی کە ئەمە قەدەغەیە، بۆیە ویستم بە شێوازێکی تر سوپاست بکەم، دوای ئەو جوامێرییەی لێم بینیت، دوای ئەوەی یۆرۆیەکت بۆ دام بێ ئەوەی داوات لێبکەم، بابەتەکە ماددە نییە، تا پێم بڵێیت پارەکە کەمبوو، بۆیە پێت دەڵێم تۆ دەست پێش خەریت کرد بۆ چاکەکردن بە بێ بیرکردنەوە. بە زەردەخەنەوە قسەم پێبڕی: دەزانم سەرگوزشتەی ژیانی خۆتم بۆ باس دەکەیت، بەڵام کوا ئەو شتەی کە لە تۆم کڕی، داناییەکە لە کوێیە؟

وتی: تەنها خولەکێك.

وتم: باشە خولەکێك چاوەڕێ دەکەم.

وتی: نا نا، چاوەڕێ مەکە، (تەنهاخولەکێك)... ئەوە داناییەکەیە.

وتم: هیچ شتێك تێنەگەیشتم.

وتی: لەوانەیە واهەست بکەیت دووچاری فێڵو تەڵەکە بوویت؟

وتم: لەوانەیە.

وتی: ئێستا بۆت ڕوون دەکەمەوە: (تەنهاخولەکێك)، ئەم وشەیە لە یاد نەکەیت. هەر کارێك ویستت بڕیاری لەسەر بدەیت، کاتێك بیرت لێ کردەوەو گەیشتیت بەچرکەساتی بڕیار لە سەردانی، خولەکێکی تر زیاتر بدە بە خۆت، تەنها شەست چرکە!

ئایا دەزانیت مێشکت تواناى وەرگرتنی چەند زانیاری هەیە بۆ چارەسەرکردن لە ماوەی شەست چرکەدا؟ بەو تەنها خولەکە، کە بە خۆتی دەدەیت پێش ئەوەی هەستیت بە دەرکردنی بڕیارێك، لەوانەیە زۆرشت بگۆڕێت، بەڵام بە مەرجێك.

وتم: ئەو مەرجە چییە؟

وتی: هەرچی هەیە لە دەروونی خۆتی دەردەکەیت، هەروەها مێشكو دڵیشت بە تاڵ کەیتەوە لە هەرچی بنەمای مرۆڤایەتیو نموونەی ڕەوشتە بە یەکجار، بۆئەوەی چارەسەرێکی بابەتیانەو بێ لایەنداری بکەیت، بۆ نموونە: ئەگەر بڕیارت دا کە تۆ خاوەن مافیو بەرامبەرەکەت ستەمی لێ کردوویت، لە ماوەی ئەو خولەکەدا کاتێك دەروونی خۆت پاك کردەوە، لەوانەیە بۆت ڕوون بێتەوە لایەنی بەرامبەریش مافی هەیە، یان بەشێك لە ڕاستی لایە، لەو کاتەدا بڕیارەکەت دەگۆڕێت بەرامبەری. یان ئەگەر ویستت کەسێك سزابدەیت، لە ماوەی ئەو خولەکەدا لەوانەیە بیانوویەك بێنیتەوەو سزاکەی سوك بکەیت، یان سزای نەدەیت، یان بە یەکجاری لێی خۆش بیت. تەنها یەك خولەك وات لێدەکات دادگەربیت لە هەنگاونان بەرەو بڕیاردانی چارەنووسساز لە ژیانتدا، لە کاتێکدا وات زانیبوو کە هەنگاوێکی دروستە، بەڵام لەوانە بوو کارەسات باربێت، تەنها خولەکێك وات لێدەکات زیاتر پابەندبیت بە لایەنی مرۆڤایەتیتو دوور بکەوێتەوە لە ئارەزوو، تەنها خولەکێك لەوانەیە ڕێڕەوی ژیانتو ژیانی خەڵکی تریش بگۆڕێت، ئەگەر یەکێك بیت لە کاربەدەستانیش ڕێڕەوی سەراپای ژیانی میللەتێك دەگۆڕێت، ئایا دەزانیت ئەو شتانەی دەربارەی خولەکێك بۆم شیکردیتەوە تەنها یەك خولەکێکی خایاند؟

وتم: ڕاست دەکەیت، منیش ئەوا لێم وەرگرتیت ئەم کڕینو فرۆشتنە، یەك یۆرۆکەت پێ حەڵاڵ بێت؟ نەمزانی کات ئاوا بە خێرایی تێدەپەڕێت. ئەم گەشتەم لەسەرجەم گەشتەکانی ترم خۆشتربوو، هەتا زۆرهەستم بە دڵتەنگی کرد کاتێك لە نیوەی ڕێگادا بەشارەکەیان گەیشتینو بەجێی هێشتم. بەڵام چارەکێك پێش ئەوەی بگەینە شارەکەیان، ویستی بە مۆبایلەکەی پەیوەندی بە کوڕەکەیەوە بکات، بۆ ئەوەی بێتە وێستگەو بیگەیەنێتەوە ماڵ، بەڵام ڕووی بە لای منداکردەوەو وتی: وابزانم مۆبایلەکەم کارتی تێدا نەماوە. منیش مۆبایلەکەی خۆم دایە بۆئەوەی پەیوەندی بە کوڕەکەیەوە بکات، بەڵام ئەوەی چاوەڕوان نەکراوبوو لە ناکاو پاش ڕۆیشتنی بە یەك چارەك دوونامەم بۆ هات، نامەی یەکەم نووسرا بوو ئەم ژمارەیە کارتێکی بە دە یۆرۆ ناردووەتە سەرحسابەکەت، نامەی دووەم نووسرابوو: مۆبایلەکەم کارتی تێدا مابوو، بەڵام فێڵم لێکردیت بۆئەوەی ژمارەی مۆبایلەکەت بزانم هەتا پاداشتی ئەو چاکەو کردەوە باشەت بدەمەوە، ئەگەرحەزت کرد ژمارەی مۆبایلەکەم یاداشت بکە، ئەگەر سەردانی شارەکەشمت کرد وابزانە دایکێك لەوێ پێشوازیت لێدەکات، بە نامەیەك ئاوا وەڵامم دایەوە: کاتێك لەسەرەتادا تەماشای چاوەکانتم کرد، وا هەستم کرد ئەوانە چاوانێکی ڕێوی ئاسان، بەڵام نەمتوانی ئەمەت پێ بڵێم، بەڵام ئێستا هیوادارم جارێکی تر ڕۆژگار بە یەکمان شاد بکاتەوە، زۆرسوپاسی ئەو داناییەت دەکەم، باش بزانە کە من زۆرگرانتر لەو پارەیە دەیفرۆشم.

تەنهاخولەکێك... داناییە، کە خستوومەتە ڕوو بۆ فرۆشتن، ئایا کێ لێم دەکڕێت لە سەردەمێکدا کە چەندانو چەندان کاتژمێر لە کات بە فیڕۆ دەچێت؟

# زانیاری گشتی

ئا: جەلال جەبار

- تێکڕای تەمەنی پشیلە (١٥) ساڵەو زمانی پشیلە ڕژێنێکی شلی تێدایەو زۆر بە ئاسانی دەتوانێت برینەکانی لەشی چاك بکاتەوە، لەشی پشیلە لە (٥٠٠) ئێسك و (٢٣٠) ماسولکە پێکهاتووەو (٣٠) ددانیشی هەیە.
- گەورەترین هێلکە هێلکەی نەعامەیە کە درێژییەکەی (١٨) سم و پانییەکەی (١٢) سم.
- سەگ لە ڕێگەی زمانەوە عەرەق دەردەدات، چونکە پێستی سەگ عەرەق دەرنادات و ژمارەی ددانەکانی سەگ (٤٢) ددانە.
- فیل (١٨) پەنجەی هەیە.
- نەعامە بە پێوە دەخەوێت.
- مێشوولە (٥) چاوو (٤٨) ددانی هەیە.
- دووپشك (٨) پێی هەیەو ڕقی لە قەرەباڵەغییە.
- حوشتر بە یەکجار دەتوانێت (٦٠) لیتر ئاو بخواتەوە.
- کیسەڵ بە تەمەنترین گیاندارە.
- خێراترین گیانلەبەری ناو ئاو ماسییەکە بە ناوی (تەن) کە خێراییەکەی (١٠٠ کم) لە کاتژمێرێکدا.
- برنج (١٠٠ملگم) ئاسنی تێدایەو قەرنابیت (٤٠ملگم)و گەنم و جۆ (٨،٥ ملگم)ی تێدایە.
- پرتەقاڵ بۆ یەکەمجار لە وڵاتی (هیندستان) دۆزرایەوە.
- گەورەترین درەخت لە جیهاندا ناوی (جەنەراڵ شیرمانە)یە، کە بەرزییەکەی (٨٥)مەترو تیرەکەی دەگاتە نزیکەی (٢٥) مەترو کێشەکەی (٢٠٣٠) تەنە کە (٤٠) خانووی (٥) ژووری لێ دروست دەکرێت و ئەم درەختە لە ویلایەتی (کالیفۆرنیا)ی ئەمەریکایە.
- دواهەمین هەست کە مرۆڤ لە سەرەمەرگدا لە دەستی دەدات هەستی (بیستن)ە.
- یەکەم گەل کە سابوونیان دروستکرد (سۆمەرییەکان) بوون.
- هەسارەی زوحەل (١٧) مانگی هەیە.
- وڵاتی چین (٦٢) پارێزگایە.
- (ئەنقەرە) لە ساڵی (١٩٢٣)ز، بوو بە پایتەختی تورکیا.
- بۆ یەکەمجار لە مێژوودا لە ساڵی (١٩٠٢) کلۆر کرایە ناو ئاوەوە لە وڵاتی (بەلجیکا).
- یەکەم وڵاتی ئەوروپی کە ئازادی دابێت بە ئیسلام وڵاتی (بەلجیکایە).
- گەورەترین پەتاتە لە مێژوودا لە شاری (جیبۆنتۆن)ی ویلایەتی (کالیفۆرنیا) دۆزرایەوە لە ساڵی (١٩٧٧) زاینی کە کێشەکەی گەیشتە (١٠،٢٠٣) کیلۆگرام.
- (١٨٠) جۆر ڤیتامین لە هەنگویندا هەیە.
- چاوی پەپوولە (١٧) عەدەسەی تێدایە.
- زەڕافە هیچ دەنگێکی نییەو تەنها لە کیشوەری ئەفریقاش دەژیت.
- درێژترین ئاژەڵ لە مێژوودا کرمێك بوو بە ناوی (قەیتانی دەریا) کە لە ساڵی ((١٨٦٤)) زاینی دۆزرایەوە درێژییەکەی نزیکەی (٥٥) مەتر بوو.
- (پڵنگ) لە کاتژمێرێکدا دەتوانێت نزیکەی (٩٠)کم ببڕێت.
- هەسارەی ((عەتارد)) هیچ مانگێکی نییە.
- پێنج یەکی لەشی مرۆڤ خوێنە، واتە ئەگەر مرۆڤێك کێشی (١٠٠) کگم بێت ئەوا ((٢٠)) کیلۆ گرامی خوێنە.
- ژمارەی دەمارەکانی لەشی مرۆڤ (٥٦٥) دەمارە.
- کورتترین ئێسك لە لەشی مرۆڤدا ئێسکێکە لە ناو گوێدا کە درێژییەکەی (٢،٦) ملیمەترە.
- کۆنترین ئاڵا لە مێژوودا ئاڵای وڵاتی (دانیمارك)ە، کە ئەم ئاڵایە لە ساڵی (١٦٢٥) زاینییەوە هیچ گۆڕانکارییەکی بە سەردا نەهاتووە.
- گەورەترین وڵات لە جیهاندا لە ڕووی ڕووبەرەوە وڵاتی ڕووسیایە کە ڕووبەرەکەی (٤٠٠ ٠٧٥ ١٧) کیلۆمەتر دووجایە.
- وڵاتی (سۆماڵ) یەکەم وڵاتی عەرەبییە لە بەرهەمهێنانی مۆزدا.
- یەکەم کەس لە مێژوودا کە وێنەی خۆی خستە سەر دراوی کانزایی (ئەسکەندەری مەقدۆنی) بوو.
- گەورەترین باڵیۆزخانە لە جیهاندا لە پەکینی پایتەختی (چین)ە کە ڕووبەرەکەی (٤٣٠ ١٠٨ ١٨) مەتر دووجایە.





# شێوازە ڕاستو دروستەکانی شتنەوەی سەوزەو میوە

و: لە فارسییەوە: بیلال باسام

بۆ لە ناوبردنی بەکتریاکان، پیسیو پاشماوە کیمیاییەکان، پێویستە میوەو سەوزەواتەکان بەر لە خواردنیان بشۆردرێتەوە.

ئایا دەزانیت ئەو پەتاتە، پرتەقاڵ، سێوە، یا تەماتانەی کە ئەمڕۆ دەیانکڕیت، پێشتر لە کوێ بوون؟ میوەو سەوزەواتەکان لەو زەویانەی کە پڕن لە مەوادی دژە نەخۆشیو سەوزی بڕی کیمیایی، گەشە دەکەن، هەرچەند پاشماوەی ئەو دژە نەخۆشیو سەوزی بڕانە کە لەسەر سەوزیجاتو میوەکان هەڵنیشتووە بە ڕوالەت بۆ بەکارهێنانی مرۆڤەکان زیانێکی نییە، بەلام ئایا بەڕاستی دەتەوێت ئەم مادە کیمیاییانە لەگەڵ ئەوەی کە دەیخۆیت بچێتە جەستەتەوە؟

کاتێك میوەو سەوزیجاتەکان ئامادەی چنین دەبن لە لایەن دەستگەلێکی جیاوازەوە دەچنرێنو پاشان دەگوازرێنەوە بۆ گەنجینەکانو دواتر بۆ میوە فرۆشییەکەی گەڕەکەکەتان، شیمانەی ئەوەی کە بەکتریا گەلێکی وەك (لیستریا، سالمونلاو ئەی کولی) لە سەر میوەو سەوزیجاتێك کە کڕیوتە هەڵنیشتبێت زۆر زۆرە، هەموو ئەم بەکتریایانە دەبنە مایەی نەخۆشی گەلێك کە لە ڕێی خواردنەوە دەگوازرێنەوەو بێگومان دەشێت بەر لە بەکارهێنانو خواردن لە سەر مادە خۆراکییەکان نەهێلرێنو بشۆردرێنەوە.

کەڵك وەرگرتن لە میوەو سەوزیجاتی تازە لە سیستمی خۆراکیدا مەسەلەیەکی ژیانییە، بەلام نەك لەگەڵ میکرۆبو حەشەرات، ئەو مادده کیمیاییو بەکتریایانەی کە لەگەڵیدایە، کەواتە وریابن بەر لە خواردن بێگومان میوەو سەوزیجاتەکان بە باشی بشۆرنەوە.

چۆن میوەو سەوزیجاتەکان بشۆینەوە:

* لە پاکڕاگرتنی چێشتخانە، کەوانتەر، سەلاجە، تەباخەکەتانەوە دەست پێبەکەن.

* هەمیشە بەر لە ئامادەکردنی خواردنەکانو بەکارهێنانی میوەو سەوزەکان، دەستەکانتان پاك بشۆن.

* سەوزەو میوە تازەکان دوور لە گۆشتە لێنراوەکان هەڵبگرە، تاوەکو ڕێ لە ئالودەبوونیان بگریت.

* لە کاتی کڕیندا، میوەو سەوزیجاتی ساغو پێگەیشتوو هەڵبژێرە، لە کڕینی جۆری پیسو لە کەدارو لە ڕادەبەدەر نەرمو بڵ خۆت بە دوور بگرە.

* هەمیشە ڕێك بەر لە کاتی خواردنیان میوەو سەوزیجاتەکان بشۆرنەوە، پێستو توێکڵی سروشتی میوەو سەوزەکان دەبنە مایەی هەڵمژینی ئاوو شتنەوەیان دەبێتە مایەی ئەوەی زووتر خراپ ببن.

* میوەو سەوزیجاتی بەستەبەندیو لە قوتونراو ئەوانیش بەر لە بەکارهێنان بشۆرنەوە تەنانەت ئەگەر لەزگەی ئەوەشی لێدرابێت کە شۆردراونەتەوە.

* گشت بەشەکانی میوەو سەوزەکان باش بشۆرنەوە تەنانەت ئەگەر نیازی خواردنی ئەو بەشانەشت نەبێت، بۆ نموونە ڕەنگە بەکتریا لەسەر توێکڵی پرتەقاڵ، یا خەیار هەڵنیشتبێت، یاخود ئەمەی کە توێکڵی ئەم میوانە لێ دەکرێتەوەو دوور فڕێ دەدرێت، بەلام ڕەنگە بەکتریاکان دزەیان کردبێتە سەر چەقۆکەو خودی میوەکان.

* میوەو سەوزیجاتەکان لە ژێر ئاوی خوڕو لەبەر ڕۆیشتوو بە شێنەیی بشۆرنەوە، هیچ جۆرە سابوونو گیراوەیەکی شتنەوەو سپیکەرەوە، یا هەر مادەیەکی شتنەوەی کیمیایی تر بەکار مەهێنە، ئەم مادە کیمیاییانە پاشماوەیەك لە دوای خۆیان لە سەر سەوزەو میوەکان بە جێدەهێڵن.

* دەرمانەکانی تایبەت بە شتنەوەی سەوزە هیچ جیاوازیەکیان نییە لەگەڵ شتنەوە بە ئاودا، کەواتە پارەکەتان بۆ کڕینی ئەوانە بە فیڕۆ مەدەن.

* سەوزەو میوە ڕەقترەکان وەك پەتاتەو سێو دەتوانیت بە شاڵێکی تایبەت بە ئاو بشۆیتەوە.

* گەڵاکانی ڕووکاری دەرەوەی کاهوو کەلەرم فڕێ بدەو گەڵاکانی دیکەش بەباشی لەبەر ئاودا بشۆڕنەوە.

* توو، ترێ، میوە وردەکانی دیکە سەرەتا لە ئاودا تەڕبکەو پاشان بە وردی بیان شۆرەوەو دواتر لە سوزگییەکدا دایانبنێ، تا ئاوەچۆڕ بکەن.

لە بیرتان نەچێت کە میوەو سەوزیجاتێك کە دەیکڕیت ڕەنگە لە دوکانەکەدا پاکژ بکەوێتە بەرچاو، بەلام بەمجۆرە نییە، هێندە هەیە کە تۆ ناتوانیت بەکتریاو مەوادە کیمیاییەکان ببینیت، هەربۆیە پێویستە سەوزیجاتو میوەکان بەر لە خواردن بشۆیتەوە.

سەرچاوە: سایتی مردمان

پەری شێخ کەریم



# خۆشەویستی فرمێسک دەڕێژێت.. بەڵام وانەی وەفاداریمان فێردەکات!

وەفاداری بە مانای فیداکاریو بەخشینو ئارامگرتن دێت، بایەخدانو ڕێزگرتنی ئەو کەسانەکە کە وەفادارن لە گەڵیداو بەردەوام دڵتەنگ بێت بە هەر زیانێك ڕووبەڕووی دەبێتەوە، بایەخدان بە هەستو سۆزیو ئەو شتانەی دڵخۆشی دەکات ئەنجامی بداتو بە پێچەوانەوە ئەو قسەو کردارانەی دڵتەنگی دەکات وازی لێبهێنێت.

زۆر کەس باس لە خۆشەویستیو وەفاداری دەکات بە بێئەوەی لە کاتی پێویستیدا بەکاریبهێنێت، بە پێچەوانەی ئەم خێزانو هاوسەرە وەفادارە، کە چیرۆکی ژیانیان بەڕاستی خۆشەویستی ڕاستەقینەمان بۆ دەردەخات با گوێبیستی چیرۆکیان بین:

کوڕێکی گەنج داوای لە کەسوکاری کرد کچێکی خاوەن ڕەوشتو دینداری بۆ بدۆزنەوە کە هاوشێوەی خۆی بێتو گونجاوبێت بۆ ژیانی هاوسەرێتی، بۆ ئەوەی هەروەك هاوڕێیانی تری خاوەن خێزان بێتو چاوەکانی ڕۆشن بێتەوە بە منداڵەکانی! بۆیە هەروەك پیشەی داواکردنو خوازبێنی هەموو کارەکان بە ڕێكوپێکی ئەنجامدرانوخزمو کەسی هەردوولا ئامادەبوونو خۆشحاڵی خۆیان بۆ ژیانی هاوسەرگیریان دەربڕی، هەمووان بێگومان بوون لەوەی ئەم دووهاوسەرە وەك هاوسەرانی تر دەتوانن پێکەوە بژین، بەڵام نەیاندەزانی بەڕادەیەکی زۆرو بێ نموونەیی وەفاداریو خۆشەویستیان هەیە بەرامبەر یەکتری.

بۆیە پاش سێ ساڵ بەسەربردنی ژیانی هاوسەرییان کەسوکاریان کەوتنە سەرزەنشتکردنیان بەوەی ئەو کەسانەی کە لەگەڵ ئەواندا ژیانی هاوسەرییان پێکهێناوە خاوەن منداڵن! ئەم سەرزەنشتانە وایلێکردن کە ڕووبکەنە نەخۆشخانە بۆ چارەسەرکردن، بەڵام بەداخەوە پاش دەرکەوتنی ئەنجامی پشکنینەکە دەرکەوت کە ئافرەتەکە نەزۆکەو منداڵی نابێت، ئەم ئەنجامەش نارەزاییو سەرزەنشتی کەسوکاری زیاتر کردو هانی هاوسەرەکەیان دەدا کە جارێکی تر خێزان پێکبهێنێت، بەڵام وەفاداری ئەم پیاوە بەجۆرێك بوو بۆ خێزانەکەی هەمیشە وەڵامی دەدانەوەو دەیگوت ڕاستە خێزانەکەم نەزۆکەو منداڵی نابێت، بەڵام لە هەستو سۆزی پاکیدا هەموو ڕۆژێك وا هەست دەکەم کە نەك منداڵێك، بەڵکو سەد منداڵم بۆ دێنێتە دنیاوە، من زۆر بە بەشی خوداو پاشان بە ئەو ڕازیمو ئەویش بە هەمان شێوە.

پاش نۆساڵ لە ژیانی هاوسەرییان هەمیشە خۆشەویستیو وەفادارییان بۆ یەکتری دەنواند، بەداخەوە ئافرەتەکە کۆمەڵێ نەخۆشی ڕووی تێکرد، دەبوایە بەردەوام لە ژێر چاودێری پزیشکدا بوایە، پاش پشکنینی نەخۆشییەکەی پزیشکەکان هەواڵێکی ناخۆشیان بە هاوسەرەکەی دا، ئەوان وتیان: مردنو ژیان بەدەست خوایە، بەڵام خێزانەکەت بۆ ماوەیەکی کورت دەژیو مردن چاوەڕێیەتی! لەگەڵ ئەوەشدا ئەم هاوسەرە دڵئارامو وەفادارە بێئومێد نەبوو، بەردەوام بە شوێن چارەسەرکردنی خێزانەکەیدا وێڵبوو، پزیشکێکی ئافرەتی بۆ خێزانەکەی هێنابووە ماڵەوە تا بەردەوام چاودێری بکاتو هەمیشەخۆشی مۆڵەتی وەردەگرت لە کارەکەی هەتا خزمەتی بکات، کاتێك دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە خێزانەکەی لە ئامێز دەگرتو چیرۆكو هەڵبەستی بۆ دەخوێندەوە، تاکەمێك ئێشو ئازاری کەمبکاتەوە، بۆیە چەند ساڵێك بەسەر ئەم باردۆخەدا تێپەڕی بەبێئەوەی ئەم هاوسەرە بێزاریو دڵتەنگی خۆی دەربخات، بەڵام بەداخەوە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ نارەحەتیو ئازاری ئەم ئافرەتە زیاتر دەبوو، بەجۆرێك

ئەم هاوسەرە هەموو پارەو سامانی خۆی سەرفکردو لە پێناویدا تووشی قەرزارییەکی زۆر بوو، لە ڕۆژی دووشەممە دوای نوێژی خەوتنان هەروەکو پیشەی جارانی چیرۆکی بۆ دەگێڕایەوە شیعری بۆدەگوتو ستایشی جوانی سیمایی‌و چاوەکانی دەکرد! بەڵام بینی کە خێزانەکەی بە چاویماڵئاوایی سەیری دەکات، فرمێسکی خۆشەویستی دەڕێژێت، زەردەخەنەیەك لە سیمایدا دەبینێت!

دوای دوو ڕۆژ لە مردنی‌و بە خاکسپاردنی، ئەو پزیشکەی چاودێر بوو لە لای سندوقێکی هێنا بۆ هاوسەرەکەی کە پێش لە مردنی خێزانەکەی لە لای دانابوو هەتا بیدات بەهاوسەرەکەی، دەزانن چی تیادا بوو؟!

شووشەیەکی خاڵی بۆن کە یەکەم دیاری هاوسەرەکەی بوو کەپێشکەشی کردبوو، لەگەڵ وێنەیەکی خۆی‌و هاوسەرەکەی کە لە شەوی خوازبێنیدا پێکەوە گرتبوویان‌و پاشان قوماشێك بەشێوەیەکی زۆر جوان ڕازانرابووەو لەسەری نووسرابوو: (خۆشم دەوێیت لەبەرخوا) کە جوانترین مانای خۆشەویستی‌و وەفاداریی دەنواندو نامەیەکی زۆر جوان کە تیایدا نووسرابوو: (هاوسەری خۆشەویستم دلگران مەبە بەمردنم سوێند بەخوا ئەگەر تەمەنی ترم پێببەخشرایە تەنها لەگەڵ تۆدا بەسەرمدەبرد، تۆ بە هەمان شێوە دەتویست پێش من بمریت منیش بە هەمانشێوە، بەڵام هەرچی ویستی خودا بێت هەرئەوە دەبێت)!

دواقسەم بۆ تۆ ئەوەیە کە دوای مردنم خێزان پێکبهێنیت، هەتا بەهانەت نەمێنی‌و چاوە گەشەکانت بە منداڵ زیاتر ڕۆشن بێتەوە.

کەواتە:

* باچیتر خۆشەویستی‌و وەفاداریمان تەنها وتە نەبێتو تەنها بۆ بەجێهێنانی کاری تایبەتی خۆمان نەبێت.

* هەموو کارێك لە پێناوی یەکتریدا ئەنجامی دەدەین با یەکەم مەبەست ڕەزامەندی خودا بێت، تا سۆزو بەزەیی خودا لە نێو ماڵەکانماندا بڵاوبێتەوە.

* هەتا لە ژیاندابن ڕێزی خۆمان‌و بەرامبەر بزانین، هەتا لە دوای مردن بە ڕێزەوە یاد بکرێینەوە.

* باخێزانەکانمان لەسەر بناغەی خۆشەویستی‌و وەفاداری بنیات بنێین.

* با پارێزگاری لە هەستو نەستی یەکتری بکەین‌و بۆ شادمانی یەکتر تێبکۆشین.

* ژیان بە فیداکاری‌و قوربانیدانەوە بەرزو گەورەو شکۆدار دەبێت، نەك بە هۆکارە مادییەکان‌و خۆشییە کاتییەکانەوە.

# ژیان فێری کردم

- ژیان فێری کردم: جیاوازییەکی گەورە هەیە لە نێوان شارەزایی ساڵەکان‌و ساڵەکانی شارەزاییدا، کەسانێك هەن خاوەنی ١٠ ساڵ شارەزایین، بەڵام ساڵێکی شارەزایی ١٠ جار دووبارە دەکەنەوە.

- ژیان فێری کردم: بۆ ئەنجامدانی هەر کارێك، هەمیشە ڕێگەی چاکترو باشتر هەیە، بۆیە هەمیشە پێویستە هەوڵ بدەین ڕێگەی باشتر بدۆزینەوە، بۆ ئەنجامدانی کارەکانمان.

- ژیان فێری کردم: چاکترە بۆ مرۆڤ کار بکاتو پەشیمان بێتەوە، وەك لەوەی ئاواتەخواز بووایە کە ئەو کارەی بکردایە.

- ژیان فێری کردم: بەهێزترین شت لەم ژیانەدا ئەو بیروبۆچوونەیە کە ئێستا کاتی دروێنەی هاتووە.

- ژیان فێری کردم: خەڵکی ئەو خێراییەیان بیردەچێتەوە کە لە ئەنجامدانی کارەکەتدا بە دەستت هێناوە، بەڵام بیر لە جۆری دەستکەوتەکەت دەکەنەوە.

- ژیان فێری کردم: زۆربەی بارودۆخی مایەپووچی ترسناك، ئەوەیە کە مرۆڤ هیواو ئاواتو ورەبەرزی لە دەست دەدات.

- ژیان فێری کردم: ئەگەر بتەوێت قسەی خۆش بۆ هەموو ئەو کەسانە بکەیت کە دەیانناسیت، یان دەتناسن، ئەوا پێویستت بە ١٠٠ کاتژمێر هەیە لە هەر ڕۆژێکدا، لەگەڵ ئەوەشدا دووچاری ڕەخنەی سووتێنەر دەبیتەوە، چونکە بە دەستهێنانی ڕەزامەندی هەموو خەڵکی کارێکی ئەستەمە.

- ژیان فێری کردم: لە ٩٥٪ خەڵکی هەڵەکانیان نابینن، وەکو چۆن حوشتر کۆپارەکەی خۆی نابینێت، هەرچەندە گەورەو دیاریشە.

- ژیان فێری کردم: گفتوگۆو وتوێژ، بە تایبەت لەگەڵ کەسانی نەزاندا، بە هەموو واتایەك هەڵەیە، چونکە خەڵکی بە ئاسانی دان بە هەڵەکانیاندا نانێن.

- ژیان فێری کردم: ڕاشکاویی لەم ژیانەدا، دوژمن‌و ناحەزانێکی زۆرت بۆ زیاد دەکات، لەبەرئەوە ڕاشکاویی هەمیشە پشوودان‌و حەوانەوە نییە.

- ژیان فێری کردم: ئێمە لە جیهانێکی ناتەواودا دەژین، لەگەڵ خەڵکانێکدا کە بێ کەموکورتی نین، کەواتە ئاگاداربە، پەیژە بە پانی هەڵنەگریت!

- ژیان فێری کردم: پێویستە لەسەر مرۆڤ لە هەڵەکانی پەند وەربگرێت.

- ژیان فێری کردم: لە (لی ئایا کوکا)وە فێربووم، کاتێك وتی: ئەگەر داوام لێ بکرێت، سیفاتی بەڕێوەبەری سەرکەوتوو لە تەنها وشەیەکدا کۆبکەمەوە، ئەوا دەڵێم: (دەرکردنی بڕیار)، چونکە ئەگەر چاکترین کۆمپیوتەرت هەبێت، باشترین ژمارەت پێ ببەخشێت، لە کۆتاییدا پێویستت بە دەرکردنی بڕیار هەیە.

- ژیان فێری کردم: دوو ڕێسا هەیە بۆ خزمەتکردنی کڕیارەکان: ڕێسای یەکەم: هەمیشە کڕیار لەسەر حەقە. ڕێسای دووەم: ئەگەر کڕیار هەڵە بوو، ڕێسای یەکەم بخوێنەرەوە.

- ژیان فێری کردم: پێویستە مرۆڤ هەرگیز نەڵێت: لە کارەکەمدا چەند دووچاری دەردەسەری‌و ناڕەحەتی‌و ماندووبوون بووم، بەڵکو پێویستە بڵێت: لە کۆتاییدا چیم بە دەستهێناوە؟




ئا: ئالانی

# چی دەکەیت... گەر خێزانەکەت داوای تەڵاقی لێکردیت؟

بێگومان پێکەوەژیان بە تایبەت ژیانی هاوسەری هەموو ساتەکانی خۆشیو شادیو ئارامی نییە، بەڵکو هەندێجار ناکۆکیو بیروڕای جیاوازو لە یەك تێنەگەیشتن وا دەکات کە کەشی تووڕەبوونو نا ئارامیو لە یەکدی زیز بوونو...هتد، بێتە گۆڕێ. بەڵام گرنگ ئەوەیە لەو کاتانەدا کەسێکی لێهاتوو بیتو کۆنتڕۆڵ لە دەست نەدەیتو کارێك نەکەیت کە بە درێژایی ژیانت لێی پەشیمان بیتەوەو پەشیمانیش دادت نەدات، هەربۆیە پێویستە لەسەر هەمووان لە کاتی تووڕەبوونو ناکۆکیدا بەشی ئاشتی تێدا بهێڵینەوەو دان بە خۆماندا بگرین، بۆ ئەم مەبەستەش کەسانی بە ئەزموونو بە ئارام بکەینە پێشەنگی خۆمانو چاویان لێ بکەین، بفەرموون با پێکەوە لەم ڕووداوە ڕابمێنینو لە ژیانی ڕۆژانەماندا بە تایبەت لە کاتی شەڕو ناخۆشی هاوسەران پەندی لێوەربگرین:

دەگێڕنەوە جارێکیان ژنو مێردێك بۆ کڕینی کەلوپەلی نێوماڵ پێکەوە دەڕۆن بۆ بازاڕ، لە گەڕانەوەیاندا ناکۆکی دەکەوێتە نێوانیانەوەو دەبێتە دەمەقاڵێیان، ئەمەش نامۆ نەبوو، چونکە سروشتی ژیانی ئەم دوو هاوسەرە وەهابوو، جاروبار دەمەقاڵێو ناکۆکیان دەبوو، دوای ماوەیەکی کەم بارودۆخیان ئاسایی دەبووەوەو هیچ ناکۆکییەك لە نێوانیاندا نەدەما، بەڵام دەمەقاڵێو ناکۆکی ئەمجارەیان جیاواز بوو لە جارەکانی دیکە، ناکۆکی ئەمجارە گەیشتە ئەو ڕادەیەی ئافرەتەکە داوای تەڵاقی لە هاوسەرەکەی کردو وتی: چیدی ناتوانم ئەم ناکۆکیو ژیانە پڕ لە نەهامەتیو ناڕەحەتییە قبوڵ بکەم، بێزاربووم، ئارامم لێبڕا، توانای خۆڕاگرتنم نەما، باشتر وایە هەر ئەمڕۆ تەڵاق نامەیەك بنووسیو کۆتایی بەم ژیانە تاڵە بهێنین.

هاوسەرەکە بە بیستنی ئەم هەواڵە زۆر نیگەرانو تووڕە بوو، دەستبەجێ پەڕاوێکی لە گیرفانیدا دەرهێناو تیایدا نووسی: (من فلانی کوڕی فلانم، ئەوا بە تەواوی ژیریمەوەو لە بارودۆخێکی زۆر ئاساییدا بڕیارمدا کە هەتا دواهەناسەی ژیانم دەستبەرداری هاوسەرەکەم نەبمو جگە لە ئەم هاوسەرە ئەزیزو خۆشەویستەم بە هیچ ئافرەتێکی دیکە ڕازی نەبم، چونکە هەرگیز بۆ تەنها ڕۆژێکیش ناتوانم لە دووری هاوسەرەکەم ژیان بگوزەرێنم)!

پاشان پەڕاوەکەی خستە نێو زەرفێکی نامەوەو بە داخراوی دایە دەستی هاوسەرەکەی، دواتر بە تووڕەیی لە ماڵ چووە دەرەوە، ئەمە لە کاتێکدا بوو خێزانەکەی نەیدەزانی چی لە ناو نامەکەدا نووسراوە، وا هەستی دەکرد ئەوە تەڵاق نامەکەیەتیو ئیدی بەم نامەیە کۆتایی بە ژیانی هاوسەرییان دێت، لەبەرئەوە کاتێك بیر دەکاتەوە زۆر پەشیمان دەبێتەوەو چاوەکانی هۆن هۆن ئەسرین هەڵدەوەرێنن، بەگریانەوە دەیگوت: بۆ کوێ ڕۆیشت؟ چی وت؟ ئایا ئەمە تەڵاق نامەکەمە، ئەمە ئەو نووسراوەیە کە کۆتایی بە ژیانی هاوسەرێتیمان دەهێنێت؟ بناغەی ژیانی چەند ساڵەمان هەڵدەوەشێنێت؟ هەموو ئەم پرسیارانە بە مێشکیدا دەهاتوو دەچوو، زۆر سەرسام بوو، بەردەوام سەرزەنشتی خۆی دەکردو دەیگوت: چیم بە خۆم کرد؟ چۆن بە دەستی خۆم ژیانی خۆمم تێکدا؟

کاتێك لەم بیرکردنەوانەدا بوو لە ناکاو هاوسەرەکەی گەڕایەوە ماڵ، ڕاستەوخۆو بە بێ سڵاوکردن ڕۆیشت بۆ ژوورەکەی خۆی، بەبێئەوەی یەك وشە لەگەڵ هاوسەرەکەیدا بڵێت!

ئەویش ئارامی لێ بڕاو چیدی نەیتوانی ئارام بگرێت، بۆیە بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بەرەو ژووری هاوسەرەکەی ڕۆیشتو لە دەرگای دا، هاوسەرەکەشی بە دەنگێکی بەرز وەڵامی دایەوەو وتی: چیت دەوێت؟ خێزانەکەشی بە قورگی پڕ لە گریانو بە دەنگێکی زۆر نزمەوە وەڵامی دایەوە، تکات لێدەکەم دەرگاکەم لێ بکەرەوە، دەمەوێت قسەت لەگەڵدا بکەم، هاوسەرەکەشی کەمێك وەستاو پاشان دەرگاکەی لێکردەوە، خێزانەکەی پێی وت: تکات لێدەکەم با پێکەوە بڕۆین بۆ لای مامۆستایەکی ئاینی تا ڕێگە چارەیەکمان بۆ بدۆزێتەوە، بەڕاستی من زۆر پەشیمانم، هیچ کات ناتوانم لە دووری تۆ بە ئاسوودەیی بژیم، نازانم چۆن ئەو هەڵەیەم کرد، لەو بڕوایەدا نەبووم تۆش بەو خێراییە ئەو بڕیارە جەرگبڕە بدەیت؟! تکات لێدەکەم چارەسەرێك بدۆزەرەوە؟

هاوسەرەکەشی بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: هەر بەڕاستی تۆ پەشیمانیت؟ نیگەرانیت بۆئەوەی ڕوویدا؟ خێزانەکەشی وەڵامی دایەوە، بەڵێ، بەڵێ، زۆر پەشیمانم سوێند بە خوا من ئەو مەبەستەم نەبوو، تەنها ئەو قسەیەم بەسەر زاردا هات، بەڕاستی زۆر زۆر پەشیمانم بۆ ئەو ڕووداوەی ڕووی دا.

هاوسەرەکەشی وتی: نامەکە بکەرەوەو تەماشایەکی ناوەڕۆکەکەی بکە!

خێزانەکەشی نامەکەی کردەوەو بە تەواوی نامەکەی خوێندەوە، لە خۆشیدا نەیدەزانی چی بکات، هاوسەرەکەی لە ئامێزگرت و وتی: ئەم ئاینە چەند گەورەیە، کە تەڵاقی داوەتە دەستی پیاوان، خۆ ئەگەر بە دەست ئێمەی ئافرەتان بووایە ڕۆژی ٢٠ جار پیاوەکان تەڵاق دەدران!

# تا زۆر بێت کەم دەبێتەوە

هۆزان جەلیل

شەوێك لە یەكێك لە باخچەكانی ناوەندی شاردا لەگەڵ هاوڕێیەكەم بە ناو درەختەكانی باخچەكەدا گوزەرمان دەكرد، گفتوگۆمان دەكرد دەربارەی ژیانی گەنجیمان، هاوڕێكەم پرسیارێكی كردو وتی: ئەوە چییە تا زۆر بێت كەم دەبێتەوە؟ پاش چەند وەلامێك وتم: تەمەنە! لەسەر گفتوگۆكەمان بەردەوام بووین، كاتێك وتوێژمان لە تەمەنمان دەكرد هەرساڵێك گوزارشتمان بە ڕۆژێك لێ دەكرد، بەسادەیی ئەو پرسیارو وەلامەمان وەرگرت، بەلام هەرچەمان شەو گفتوگۆ كرا لەسەر ئەو پرسیارو وەلامە، هەڵبەت ئەمجارە لەگەڵ هاوڕێكەم نەبوو، بەڵكو لەگەڵ ناخی خۆمدا بوو، پرسیارو وەلامێك بوو هەموو هزری تەنیبووم.

لە گفتوگۆكەدا دەوترا گرنگە بزانین خۆشحاڵبین، یان خەمبار، ئێمە هەین گرنگە بوونی خۆمان بسەلمێنین، ئەو كارانە چین و چۆن بە ئەنجامی دەگەیەنین؟ بۆ كاری بۆ دەكەین؟ بە چ كارێك دەست پێ بكەین؟ تا لە كۆتاییدا ببینە پاڵەوانی ئەم ژیانە، بردنەوە مسۆگەربكەین، بە بەرهەمەكانمان خوداو پاشان مرۆڤایەتی خۆشحاڵ بكەین، بۆ هەمیشە بە كارو بەرهەكانمان بنازین، ئەمەش هەوڵو تێكۆشانو ماندووبوونو لە خۆبووردنو بەرنامەسازی و پلانی دروستی دەوێت بۆ ئەوەی ببیتە خاوەن سەرمایەیەك كە لێوان لێو بێت لە ڕەوشتی بەرزو یارمەتی و لێبوردەیی...

پاشان دەوترا زۆر گرنگە ژیرانە مامەڵە لەگەڵ دنیادا بكەین، لە چیدا ساتەكانی تەمەنمان بە كار دەهێنین، چی تیا تۆمار دەكەین، ئەوترا ئەگەر ڕاستگۆیی و بەخشندەیی و وەفاداریی و لێبووردەیی... تیا تۆماركرا، ئەوا هەڵگری پەیامێكیت كە دەزانیت بۆ كوێ هاتوویتو بۆ كوێش دەڕۆیت، دەوترا ئەگەر دنیا پەرستی و دووڕوویی و درۆزنی و خودپەسەندی و خراپەكاری... تیا تۆماركرا، وەك مرۆڤێك تەماشا دەكرا كە دنیا وەك ئاوێكی سوێر دەبینێت، تا لێی بخواتەوە زیاتر تینووی دەبێت، واتە تینوو بوونێك بۆ شتانێك كە بە بێزراوی لێی دەڕوانرا.

دەوترا مرۆڤەكان ئەو دنیایەی تێربوونی بێهودەیە، بە هۆنراوەیەك وەلام درایەوە

هیوای دونیا خۆر، وەك دەریا وایە

دەریای بێقەراغ كۆتایی نایە

ناگاتە ئامانج چەند پەل بهاوێ

ئەمرێ ئەخنكێ بە قومە ئاوێ

لە گفتوگۆكەدا ئەندامەكانی جەستە ئەوانیش لە ئێستاو داهاتوویان دەدوان: ڕاستە من وەك سییەكان دەتوانم هێندەی قەبارەی خۆم هەوای خاوێن هەڵمژم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە هەوا لەسییەكان دەتۆرێن و هاوكاری سییەكان ناكەن.

ڕاستە من وەك دەستەكان بەوپەڕی هێزەوە دەتوانم كارەكانم ئەنجام بدەم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە دەستەكان بێ نازو سەرگەردانن!

ڕاستە من وەك لاقەكان دەتوانم بە پانتایی زەویدا گوزەر بكەمو بە ئاسوودەیی ساتەكانی ژیانی تیا بگوزەرێنم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە دەتۆرێم لە فراوانی زەوی و ئارام دەگرم لە باوەشی زەویدا.

ڕاستە من وەك هەستی بۆنو تام دەتوانم تێربم بە بۆنی گوڵەكانو خواردنە بەتامەكان، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە بۆنە خۆشەكان بە من نامۆن، تامە شیرینەكان تاڵ دەبن.

ڕاستە من وەك لێوەكان دەتوانم زەردەخەنە ببەخشم و دڵەكان لە خەم بڕەوێنم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە زەردەخەنەكان كۆچ دەكەنو دڵە خەمگینەكان چاوەڕوانن.

ڕاستە من وەك دڵ هەموو كات خۆشەویستی دەبەخشم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە دڵ واتای خۆشەویستی فەرامۆش كردووە.

ڕاستە من وەك گوێ دەتوانم ئاوازە ناوازەكان ببیستمو وتەكان هەڵبسەنگێنم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە نامۆ دەبم بە ئاوازی خۆشو لێكدانەوەی پەیڤەكان.

ڕاستە من وەك مێشك دەتوانم شادبم بە ئامانجو سەركەوتنەكانم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە ئامانجو پلانەكانم لە چاوەڕوانی بیرمدا سەردەنێنەوە...

ڕاستە من وەك چاو دەتوانم هەموو جوانییەكانی سروشت بە ڕەنگاوڕەنگ ببینم، بەلام ڕۆژێك چاوەڕوانە چاوەكانم ڕەنگاوڕەنگی خۆی لە دەست داوە!

زۆر گرنگە منو تۆی ئازیز، پێش ئەوەی جەستەمان، ئەندامەكانمان، ئەو ئەركانەی پێیان سپێردراوە لە دەستی بدەین و فەرامۆشی بكەن با لەم ساتەوە كاری پێ ئەنجام بدەین، گرنگ نییە كاری زۆر ئەنجام بدەین، گرنگ ئەوەیە چ جۆرە كارێك و بۆچی ئەنجامی دەدەین، تا ئەو ڕۆژانەی چاوەڕوانە، ڕاستە كارەكان ناتوانن بەردەوام بن، بەلام ئەنجامی كارەكان شاهیدن بۆ هەمیشە بە زیندوویی دەمێننەوە، دەبا بەڵێن بدەین بە كارەكانمان پەروەردگارو خودی خۆمانو مرۆڤایەتی و نیشتمانمان ئاسوودە بكەین، تا بۆ هەمیشە گەواهی بدەن كە بوونمان جێگەی شانازی بووە، نەك شەرمەزاری.

# دڵی شوشه‌یی

و: فیرده‌وس حه‌سه‌ن

تازه ئه‌مرۆ خه‌ریكبوو نه‌فه‌سێكی ره‌حه‌تم ده‌كێشا، چونكه تاقیكردنه‌وه‌ی كۆتایی ساڵم ته‌واو ده‌بوو، ده‌متوانی كه‌مێك بخه‌وم، یان له‌گه‌ڵ هاورێكانم قسه بكه‌مو بۆ ماڵی خزمه‌كانم برۆم، یان بانگهێشتی میوان بكه‌م، هه‌ر به‌وشێوه‌یه‌ی كه بیرم ده‌كرده‌وه هاورێكانم هه‌موویان له حه‌وشه‌ی زانكۆدا چاوه‌رێم بوونو به بینینی من وتیان:

- فاتیمه بۆچی ئه‌وه‌نده دره‌نگ له هۆڵه‌كه هاتیته ده‌ره‌وه؟ ئێمه نزیكه‌ی نیوكاتژمێر له‌مه‌و پێش ته‌واو بووین، ده‌ستمان كرد به پێكه‌نینو هه‌موومان پێكه‌وه بۆ سووچێكی زانكۆ كه ژماره‌یه‌كی زۆر شوێنی دانیشتنی تێدا بوو، به شێوه‌یه‌كی زۆرجوان رازابووه‌وه رۆشتینو ده‌ستمان كرد به قسه كردن، له ناكاو له هاورێكانمم پرسی هاورێیان كاتتان هه‌یه سه‌بارت به بابه‌تێك قسه بكه‌ین؟

ئه‌وانیش وتیان:

بۆ نا، هه‌رچه‌ند زیاتر قسه بكه‌ین زیاتر له لای یه‌كتر ده‌مێنینه‌وه، دوایی ده‌بێت هه‌ریه‌كه‌مان بۆ شاره‌كانی خۆمان بگه‌رێینه‌وه، یه‌كێك له هاورێكانم وتی: فاتیمه گیان سه‌بارت به چ بابه‌تێك قسه بكه‌ین؟

منیش به‌بێ پێشه‌كی وتم دڵ! به وتنی ئه‌م وشه‌یه قاقای پێكه‌نین به‌رزبوویه‌وه‌و هه‌موویان به یه‌ك ده‌نگ وتیان:

ئه‌ی عاشقی به‌دبه‌خت!

- من سه‌رم سورما ئاخر ئه‌م هه‌موو بابه‌ته ده‌رباره‌ی دڵ هه‌یه، بۆچی ئه‌وان یه‌كسه‌ر وا بیریان كردووه كه من عاشق بووم؟ كاتێك بیرم كرده‌وه بینیم هه‌رله‌خۆیانه‌وه وایان نه‌وت! هه‌ر بۆیه منیش له‌گه‌ڵ ئه‌واندا پێكه‌نیم وتم ده‌ی ئیتر...

راستی هاورێیان ئێوه ده‌رباره‌ی دڵ چی ده‌زانن؟

یه‌كێكیان وتی:

- هه‌مووان ده‌ڵێن دڵ له گۆشت پێكهاتووه‌و ناوه‌وه‌ی پره له خوێن، یه‌كێكی تریان وتی:

- شاعیران دڵ به شتی زۆرباش ده‌شوبهێنن، دڵ جێگای خۆشه‌ویستی، رقو كینه‌و غیره كردنه، یه‌كێكیان دڵی به جێگای یادگاری خۆشو ناخۆش وه‌سفكردو یه‌كێكی تریشیان دڵی به شوشه وه‌سفكرد، شوشه‌یه‌ك كه به بوونی خه‌م ده‌شكێت، ئه‌وانیش باسی خۆشییه‌كانو خه‌مه‌كانی خۆیانیان كرد، خۆشییه‌كان كه زۆر خێرا تێده‌په‌رنو داستانی خه‌مه‌كانیشیان دووردرێژ بوو.

یه‌كێك له هاورێكانم به‌م شێوه‌یه به‌رده‌وامبوو:

- له ژیانمدا له خه‌موخه‌فه‌ت زیاتر هیچی تر نه‌بووه به نسیبم، خۆشی من ته‌نها دایكم بوو، ئه‌ویش ماڵاوایی لێكردین، كه‌واته دڵ جێگای خه‌مو دڵته‌نگییه!

یه‌كێكی دیكه له هاورێكانم وتی:

- براكه‌م هه‌رچه‌ند هه‌وڵی دا كه له زانكۆ وه‌رگیرێت، به‌ڵام وه‌رنه‌گیرا، كه‌واته دڵ گۆرستانی زانستو ئاره‌زووه‌كانه!

ئه‌وی تریان وتی:

- هاوسه‌ره‌كه‌م هه‌ست به بوونی من ده‌كات، كه‌واته دڵ جێگای ده‌ربرینی هه‌سته جوانه‌كانه!

یه‌كێكی دی له هاورێكانم وتی:

- هه‌رچه‌ند چاكه ده‌كه‌م هه‌ر ناڵێی هیچم كردووه، چه‌ند رۆژ له مه‌وپێش كاتێكی زۆرم ته‌رخانكرد بۆ فێركردنی هاورێیه‌كم له وانه‌ی (ئانالۆگ) كاتێك كه تاقیكردنه‌وه‌ی ئه‌نجامدا وتم: یارمه‌تییه‌كانی من هیچ سوودێكی هه‌بوو؟ توانیت به باشی وه‌ڵام بده‌یته‌وه؟ كه‌چی له وه‌ڵامدا وتی:

- جا تۆ چیت كردووه، ته‌نها چه‌ند پرسیارێكی منت وه‌ڵام داوه‌ته‌وه، خۆم زه‌حمه‌تم كێشاوه، كه‌واته دڵ جێگای خنكاندنی چاكه‌كانه.

له ناكاو هانیه‌ی هاورێم ده‌ستی كرد به گریانو وتی:

- ئێوه هه‌موتان باسی دڵو ده‌ردو رەنجو خه‌مو شادیتان كرد، به‌ڵام هیچ كامتان ئاگاتان له به‌سه‌رهاتی من نییه، خه‌می من له هه‌موو خه‌مه‌كانی دنیا زیاتره، هه‌موومان سه‌رسام بووین، چونكه ئه‌و هه‌میشه له هه‌موومان شادتر بوو، هه‌میشه وته‌ی خۆشو پر له پێكه‌نینی به (SMS) بۆ ده‌ناردین، ئه‌و كچێكی كه‌شخه‌و جوانو میهره‌بان بوو، زۆریش جێگه‌ی سه‌رنجبوو، هه‌میشه ده‌مگوت: خۆزگه من له جێگه‌ی ئه‌و بوومایه، له ناكاو تووشی دڵه خورپه بووم خوایه رووكاری ده‌ره‌وه‌ی مرۆڤه‌كان له‌گه‌ڵ ناخیاندا چه‌نده جیاوازه!

ئه‌و دوای گریانێكی زۆر كه‌مێك ئارام بووه‌وه‌و وتی:

-دڵی من جێگای كینه‌یه، حه‌سودیو تۆڵه‌و زۆر شتی تره.

كه‌مێك دڵخۆشیم كردو وتم: هانیه گیان به باشی قسه بكه تا خه‌مه‌كانت سوك ببێت.

ئه‌و وتی:

- من ته‌مه‌نم پانزه ساڵ بوو كه عاشقی كورێكی جوانی چاوسه‌وزی باڵابه‌رز بووم، به بێ ره‌زامه‌ندی دایكو باوكم‌و به ویستی خۆم زه‌ماوه‌ندم له‌گه‌ڵدا كرد.

ئێمه هه‌موومان سه‌رسام بووین!

- هانیه تۆ زه‌ماوه‌ندت كردووه؟! ئێمه هه‌موومان وامان زانی تۆ هێشتا سه‌ڵتیتو چه‌ند داواكارێكی باشمان بۆ دۆزیبوویته‌وه.

ئه‌و وتی: نه‌ك هه‌ر سه‌ڵتیش نیم، به‌ڵكو من دایكێكم كه خه‌می دووری منداڵه‌كه‌م شێتی كردووم!

قسه‌كانمان پێ نه‌بری، چونكه چیرۆكه‌كه‌ی سه‌رنجی راكێشابووین، ئه‌و به‌رده‌وام بوو:

-من له‌گه‌ڵ كورێك زه‌ماوه‌ندم كرد كه به پێچه‌وانه‌ی جوانییه‌كه‌یه‌وه دوای ئه‌وه‌ی كه زه‌ماوه‌ندم له‌گه‌ڵ كرد، هه‌ستم به كۆمه‌ڵێك سیفه‌تی ئه‌و كرد، ئه‌و ماده‌ی هۆشبه‌ری به‌كار ده‌هێناو ده‌ستپیس و دڵپیسیش بوو! یه‌كه‌مجار كاتێك كه زێره‌كانم دانه‌دانه ون ده‌بوون، وامده‌زانی كه من ئاگام له خۆم نه‌بووه‌و له شوێنێك داماناون، یان ونم كردوون، به‌ڵام

دوایی زانیم کە ئــەو کەلوپەلەکانی ماڵەکەو زێڕەکانــی منی بــۆ کڕینی مادەی هۆشــبەر فرۆشتووە!

کاتێك کە ئەم مەســەلەیەم پێگوت، ئەو کەوتە تکاکردنو پاڕانەوەو وتی:

- هانیەگیــان بەخــوا تاوانــی من نییە، گوێ لە قسەکانم بگرە، بەخوا فێڵم لێکراوە، حەزم دەکرد وازی لێبهێنم، بەڵام دەترسام کە داوای یارمەتی لە تۆ بکەم، سەختگیرییەکانمو دڵپیسیەکانیشم هەر لەبەرئەوەبوو دەترسام.

ئــەو هــەر دەپاڕایــەوە، مــن هەســتام ڕاســتەوخۆ ڕۆیشــتمەوە ماڵی دایکم، لە تاو خەفەت پەنام بۆ خوێندن بردو خۆشبەختانە لــە زانکــۆ وەرگیرام، ئێســتا نــە هەواڵم لە منداڵەکەم هەیەو نە لە هاوسەرەکەشم.

زۆر حەزدەکــەم یەکجــاری تــر قــژی منداڵەکەم شانە بکەمو ڕووخساری ماچ بکەم، ئێســتا زانیت بۆچی دڵــی من بووەتە جێگای خەمەکان؟

- مرۆڤ بۆ ئەم کێشە بچووکانە دەتوانێت ڕێگا چــارەی زۆر بدۆزێتەوە، ئەو خۆی تورە کردو وتی: تۆ بە کێشەیەکی وا گەورە دەڵێیت بچووك؟

**وتم: بەڵێ هەموو شــتێك ڕێــگا چارەی هەیــە تەنها ئەگەر مرۆڤەکان بمرن ناتوانین هیچ کارێکیان بۆ بکەین!**

ئــەو وتــی: قســەکردن ئاســانە، بــەڵام جێبەجێکردنی گرانە!

پێم وت: جێبەجێکردنی زۆر ئاسانە، تەنها تۆ هاوکاریم بکە، ئەو کاتە هەم منداڵەکەتو هــەم هاوسەرەکەشــت بە ســەلامەتی بۆ لای تــۆ دەگەڕێنەوەو پێکەنیمو وتــم: (هەروەها دڵیشت!)

تەنهــا گوێ لە قســەکانم بگــرە، هەموو هاوڕێیان حەپەســابوون، ئــەت وت ئیتر ئەو هەموو فەزایــەی زانکۆ ئەو هەموو کوڕوکچە سەرنجڕاکێشــانە، ئــەو حــەوزە بچووکــەی بەردەممــان کە پڕبوو لە ماســی جوان، گوڵە ڕەنگاوڕەنگەکانیــش کــە بەردەممانیان وەکو بەهەشــتی خواوەند پیشان دەدا، هیچ کامیان نەدەبینــی تەنهــا گوێیان لە قســەکانی منو هانیە گرتبوو، من بە هانیەم وت:

- ئازیــزم تۆ بــۆ ئــەم کارە دەبێت دڵی خــۆت وەکو دەفتەرێك بکەیتەوەو بە خوێنی خۆت، بــە جەوهــەرو ئەقڵی خــۆت، قەڵەم دروست بکەیت.

ئەو وتی: لە قسەکانت تێناگەم!

وتــم: ئارامــت هەبێــت وردە وردە تــێ دەگەیت، ئێستا لە خەیاڵی خۆتدا لەسەر ڕووی دڵت بنووسە هاوسەرەکەت چ سیفەتێکی باشی هەبوو؟ ئێستا سەیری بەشی سەرەوەی پەڕەکە بکە، چ سیفەتێکی خراپی هەبوو کە لە دڵتدا نوســرا؟ ئەوانە بە بیرکردنەوە بســڕەرەوە، ئێســتاش مۆڵەتی ئێمە بدە بۆت بنووســین، هانیەگیان دنیا ئەوەندە ناشــرین نییە کە تۆ هەستی پێ دەکەیت، سەیری دەوروبەرت بکە، تۆ دەتوانی پەند لە هەموو دروســتکراوەکانی دەوروبەرت وەرگریتو لەزەتیشی لێ ببینیت، تۆ هێشــتا گەنجیت، دەبێت پێبکەنی دەبێت کەشــخەبیت، بەڵام بۆ ئەمکارە پێویستت بە چەند شــتێکە، تەشو، دەستەسڕ، پاککەرەوەی شوشە، پێکەنیو وتی:

- مەتەڵم بۆ باس دەکەیت؟

وتــم : ئەگەر هەموو مرۆڤەکان هەســت بەوە بکەن کە ئێمە هەمووومان پێویســتیمان بەم ســێ شــتەیە، ئەو کاتە هەمــوو جیهان خۆشــبەخت دەبوون، هەر بەوشێوەیە خوای گەورە ئێمەی بە خۆشەویستی دروستکردووەو مۆڵەتیشــی بە ئێمە داوە کە بە خۆشەویستی ژیان بەرینەســەرو بە شێوەیەکی باش سوود لــە تەواوی نیعمەتەکانــی وەربگرین کە پێی بەخشیوین).

هانیەگیان ئێوە باســی دڵتان کرد، بەڵام من ئەمرۆ دەمەوێت باسی دڵی خۆم بکەم تۆ تەنها گوێ بگرە.

من لە ژیانمدا دڵێکی شوشــەیم بۆ خۆم هەڵبــژاردووە، دڵێك لە شوشــەیە، بەڵام هیچ قورساییەك ناتوانێت بیشکێنێت، ئەو وتی:

- دڵی شوشەیی؟ چۆن چۆنی؟

وتم: ئێستا بۆت باس دەکەم، منیش وەك تۆ ناڕەحەتی زۆرم لە ژیانمدا کێشاوە، کە بە هــۆی بێ ئەزموونییەوە تووشــی هەڵەی زۆر بووم، ڕۆژێــك لەبەرخۆمەوە بیرم دەکردەوە، خوایــە تــۆ دەڵێیت مــن بەندەکانــی خۆمم خۆشــدەوێت، ئەی بۆچی ئەم هەموو بەڵایە بەســەر مندا دێت؟ لە ناکاو ئایەتێکی جوانی قورئانم بیرکەوتــەوە کە دەفەرموێت: (وما ظلمناهم ولكن كانوا أنفســهم يظلمون)، هەر ئــەم ئایەتــە هۆکارێك بوو بۆ مــن، لە ناکاو ئیلهامێك لە دڵمدا دروستبوو:

- دڵت بشۆ! بە خەیاڵی خۆم تەشوویەکم هەڵگرتو بەرەو دڵم ڕۆیشتم، لە هەر شوێنێکدا ناڕەحەتیــم لە هەرکەســێك هەبوو، گرێیەك لە دڵمــدا هەبوو، هەموویانم بە تەشــووەکە ماڵــیو لە دڵم دوورم خســتەوە، تەواوی ئەو بەشانەی دڵم کە دەروونمی بێزار کردبوو بە شوشــە پاککەرەوەو دەستەسڕ پاککردەوە، کە لە جیاتی گۆشــتو خوێن دڵــم وەك بڵقێکی شوشــەیی لێکرد، بڵقێك کە تەنها منی تێدا بــوو لەوێوە دەمتوانی لەو ماڵە شوشــەییەوە سەیری دەرەوە بکەم، تێگەیشتم کە دەرەوەی دڵم جوان نییەو دیســان شتی خراپ دەبینم، بە خەیاڵی خۆم لە گوڵفرۆشــە ناســراوەکان گوڵــم کڕیو لە دەرەوەی دڵم چاندم، ئێســتا من خاوەنی دڵێکی شوشــەیی سافو بێ ڕقو کینەمو لە دەرەوەی دڵیشم گوڵی ڕەنگاو ڕەنگم هەیە، کە ڕۆژانە دادەنیشــم سەیریان دەکەم، ئاویان دەدەمو لە نێوانیشیاندا باشترینەکانیان دەبەمە دڵمەوە.

هانیەگیان وەرە ڕقو کینەت لە هەرکەس هەیــەو ئەم ڕقو کینەیە کە بە دیواری دڵتدا خۆی چەســپاندووە بە تەشوو لێی بکەرەوەو دووری بخەرەوە، دڵت بشۆو پاشان بەرەو ڕووی کێشەکان برۆ، ئەو وتی: ئەمجارە خۆم یەکەم بە خوای گەورەو پاشان بە تۆ دەسپێرم.

وتم: کەواتە وەرە ئێستا دەست پێ بکەین، بە دەنگی بەرز وتم خواتان لەگەڵ هاوڕێیان، لە ماڵی هانیەگیان یەکتــری دەبینینەوە، لە کۆبوونەوەی هەموو خێزانەکەی هانییە گیان، دەستی هانیەم گرتو ڕاستەوخۆ بردمە ماڵی خۆمــان، داوام لە باوکم کــرد کە لەگەڵماندا بێــت بۆ ماڵــی هانییــەو تا بڕۆیــن بۆ لای هاوســەرەکەی، بەرنامەڕێژییەکانم بە باوکم ســپارد، کە لە دەرگاماندا هاوسەرەکەی هانیە بە خۆشــحاڵییەوە پێشــوازی لێکردین، دوای گفتوگۆیەکی زۆر ئەو وتی:

هاوڕێــی خراپــم هەبــوو کــە زۆر بــێ ویژدانانــە تووشــی ئەو هەڵانــەی کردم، من هانیــەو منالەکەمــم خۆشــدەوێت، هەروەها لەبەرئــەوەی کە پارەیەکــی زۆرم بۆ کڕینی مادەی هۆشبەرو خەرجی ماڵەکە نەبوو، هەر بۆیە تووشــی کاری هەڵەبــووم، باوکم ئەوی بردە لای پزیشــكو ســێ ڕۆژ لە نەخۆشخانە خەوێنــرا، بۆئــەوەی کاریگــەری مــاددە هۆشــبەرەکانی لەسەر نەمێنێت، ئەو دووبارە گەڕایەوە لای هاوسەرو منداڵەکەی، ئەمرۆ کە ئەم چیرۆکەتان بۆ دەنووســم بڕیارە لەگەڵ هاوڕێکانم بڕۆین بۆ ماڵیان!

زۆر بیرم کردەوە کە چ شــتێکی بۆ بەرم بــاش بێت، (بڵقێکی شوشــەیی)م لە شــێوەی دڵــدا پەیدا کــردو ناوەکەیم پڕ کرد لە وردە لمی ڕەنگاوڕەنگ، لەگەڵ گوڵی جوانو لەسەر کاغەزێك نووســیم:(هانیەگیان ئێمەی مرۆڤ دەبێت قەرزارەکان ببەخشینو بە شێوەیەکی جوانیش مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین).

لەگەڵ هاتنی ســاڵی نوێــدا، دڵمان نوێو دیوارەکانــی دڵمــان پــاك بکەینەوە، ســافو زوڵاڵ وەکو ئــاو، هەمووانمان خۆش بووێتو هەموومــان باشــی بکەیــن، تەنانــەت ئــەو کەسانەش کە لەگەڵماندا خراپ بوون، چونکە هیــچ کەس بەکاری بــاش خراپ نابێتو کەم نابێتەوە، عەشقی خوایی وەکو گوڵە جوانەکان لە دڵماندا بچێنیــن، چاوەکانمان فێر بکەین کە هەموو شــتەکان بە باشی ببینن؛ هەڵبەتە هۆشیارانە شــتە خراپەکانیش بگۆڕن بۆشتی باش، ئەگەر کەســێك لەگەڵماندا خراپ بوو، ئێمەش خراپ بین لەگەڵیدا ئەو کاتە ئێمەش وەك کەسە خراپەکان سەیرمان دەکرێت، ئەو کاتە باشــێك کەم دەبێتەوەو خراپێکیش زیاد دەبێــت)! هانیە گیان هــەوڵ بدە باش بیتو باشەکانیش زیاد بکەیت.

سەرچاوە/ گۆڤاری خانواده سبز/ژ. ١٧٤

# بۆ ژیانێکی خێزانی لێوان لێو لە ئاسوودەیی

ئا: پێگەرد فارس

هەموو ئافرەتێك هەوڵی ئەوە دەدات ژیانی ئاوێزان بکات لە سەرکەوتنو بەختەوەری لە ژیانی هاوسەریدا، دەخوازێت جێ پەنجەی لە بەختەوەریو داهاتووی منداڵەکانیدا دیار بێت، چەند کلیلێك کە دەبنە مایەی کردنەوەی دەروازەی ژیانێکی هاوسەری لێوان لێو لە ئاسودەییو بەختەوەری، گرنگترینیان ئەمانەن:

یەکەم: پیاوان ئافرەتێکیان خۆشناوێت کە زۆر سکاڵا دەکات، هەندێك ئافرەت بە دەرکەوتنی هاوسەرەکانیان سکاڵاکانیان دەست پێدەکەن، لە کاتێدا گەڕانەوەیان بۆ ماڵ بۆئەوەیە کەمێك پشوو بدەنو بحەوێنەوە، نەك گوێگرتن بۆ سکاڵا، بۆیە کاتێکی گونجاو هەڵبژێرە بۆ ئەوەی وەڵامی گونجاوت دەست بکەوێت.

دووەم: هەوڵ بدە زیاد لە توانای هاوسەرەکەت داوا مەکە، ئەگەر ئەو بتوانێت زیاتر لەوەی دەتەوێت بۆت ئامادە دەکات، بۆ ئەوەی ئاسانکاری بۆ بکەیت باش وایە تۆش یارمەتی بدەیت لە کۆکردنەوەی بڕێك پارە با کەمیش بێت، بێگومان کاتێك دێت کە زۆر سوودی لێ وەردەگرن.

سێیەم: ژیان زۆربەی کات پێویستی بە قوربانیدان هەیە، بە کەمی مەزانەو بۆ هەندێك بابەتی گرنگو پێویست تۆ دەست پێشخەربە، بۆ نموونە ئارەزووی سەیرانت هەیەو خۆتت بۆ ئامادە کردووە، بەڵام هاوسەرەکەت لەو کاتەدا ئامادە نییەو ئەوەی پێخۆشترە کە لە ماڵەوە بمێنێتەوەو پشوو بدات، تۆش دوای بخەو پێی بڵێ حەوانەوەی ئەو گرنگترە، بێگومان زۆر خۆشحاڵ دەبێت بەو هەڵوێستەو سوپاست دەکات، دواتر سەیرانێکی زۆر خۆشترت بۆ ڕێکدەخات.

چوارەم: ڕێز لە کەسو کاری هاوسەرەکەت بگرەو جیاوازی مەکە لە نێوان ئەوانو کەسوکاری خۆتدا، دان بگرە بە خۆتداو توڕە مەبە لە کاتی مامەڵەو هەڵسوکەوت کردن لەگەڵیاندا، بە تایبەتی دایكو باوکی بە ڕوویەکی خۆشەوە لەگەڵیان بدوێ، بیر بکەرەوە تۆش دەبیتە خەسووی سبەینێ، پێت خۆشە چۆن مامەڵەت لەگەڵ بکرێت؟!

پێنجەم: مەبەرە هۆکاری ئاژاوەو دەنگە دەنگ، ئەگەر کێشەیەکیشتان هەبوو، ڕێگە مەدە کەس بەشدار بێت لە چارەسەری کێشەکانتان، زۆربەی کات کەسی سێهەم دەبێتە لایەنگری یەکێكو ناتوانێت چارەسەر دروست بکات، کەواتە بەشداری کەسوکار، یان هاوڕێ هەڵەیەکی گەورەیە، مەگەر حاڵەتێکی زۆر پێویست، ئەویش با کەسێك بێت بێلایەنانە بەشداربێت تا بتوانن چارەسەر بدۆزنەوە.

شەشەم: دوورکەوتنەوە لە قسە دابڕینو وەڵام نەدانەوەی هاوسەر، سەیرە هەندێك شانازی دەکەن کە ماوەی مانگ زیاترە قسەیان لەگەڵ هاوسەرەکانیان نەکردووە، هەرچەندە لە یەك ماڵدا ژیان بەسەر دەبەن، ناکۆکیو دوورکەوتنەوە لە یەکتر هیچ سوودێکی نییەو بێگومان ئەوە پاشماوەیەکی دەروونی لە هەردوولا بەجێدەهێڵێت کە هەڕەشە لە داهاتوویان دەکات.

حەوتەم: گرنگی بە پاكوخاوێنی خۆتو جلو بەرگو خۆ جوانکردنو ناو ماڵت بدە، هەوڵ بدە گۆڕانگاری بکەیت بێ ئەوەی خەرجی زیاتر بەکار بهێنیت، بە تایبەتی دانانی گوڵی سروشتی کاریگەری چالاکی دەروونی هەیە، دەبێتە یەکێك لەو کلیلانەی دەرگای بەختەوەری دەکاتەوە.

هەشتەم: بە پێی توانای خۆت ئەو ئازارانەی هاوسەرەکەت بووەتە هۆکار بیر خۆتیان بەرەوە، بێگومان ئەویش هەمان هەستی هەیە هەرچەندە بیشارێتەوە، هەوڵ بدە لێبووردن یەکێك بێت لەو ئاکارانەی کە پەیوەندییەکان پتەوتر دەکاتو ئاسوودەتان دەکات.

ئەگەر ئافرەت تایبەتمەندییەکانی هاوسەرەکەی بزانێت، ئەوە بە ئاسانی دەتوانێت پەیوەندییەکی سەرکەوتوو بەردەوامی ئاسوودەو کامەران بەسەربەرێت ئەویش بە ئەنجامدانی:

١- دەرخستنی ڕێزوخۆشەویستی بۆ هاوسەر، کاتێك کارێك ئەنجام دەدات، دەستخۆشی لێ بکەو ستایشی بکە، بۆ نموونە بڵێ تۆ توانایەکی وات هەیە کە

ئەگەر بتویستایە دەبوویتە ئەندازیارێکی مەزن، زۆر هەڵەیە ڕەخنەی لێ بگریتو کەموکورتی کارەکەی دەربخەیتو پێی بڵێیت تۆ کەسێکی بێ سوودیو سووکایەتی پێ بکەیت.

٢- پیاوان بیرەوەریان کەمترە لە ئافرەتان لە بوارەکانی ژیاندا، بۆ نموونە یادی ڕۆژی هاوسەرگیری، یان لە دایکبوونی یەکێك لە منداڵەکان، تەنانەت لەوانەیە ئەو پێویستیانەی کە خێزانەکەی داوای دەکات بیربچێتەوە، لەم کاتانەدا پێویستە لە لۆمەکردن بە دووربیت.

٣- پیاوان زۆر حەز بە قسە کردن ناکەن، کاتێك هاوسەرەکەت ماندووەو لە کار دەگەڕێتەوە، دەست مەکە بە پرسیارکردن لێی، ڕێگەی بدە کەمێك بحەوێتەوە، پاشان ئەو خۆی دەست بە قسەکردن دەکات دەربارەی ئەوەی کە بیری لێ دەکەیتەوە.

٤- پیاوان گرنگی زۆر بە کارەکانیان دەدەن، هەروەك دەبینرێن زۆربەی کات تەنانەت لەسەر خوان پەیوەندی تەلەفۆنی دەکات، تۆش گرنگی دانت بۆی دەربخەو دەربارەی ئەوە پرسیاری لێ بکە بۆ ئەوەی هەست بکات زۆر لێوەی نزیکی، ئەو کات دەتوانیت تۆش لە بارەی کاری خۆت، یان ماڵەوە بدوێیت، ئەویش بە هەمان بەرەوپیرچوونت بۆی وەڵامی بۆت دەبێت.

٥- پیاوان هەوڵ دەدەن پارێزگاری شوێنی خۆیان بکەن لای هاوسەرەکانیان، زۆر هەڵەیە بەشێوەیەك ڕەفتار بکەیت کە لەژێر ڕکێفی ئەودایە، یان پێی بڵێ دەبێت بگۆڕێیت بۆ ئەوەی بتوانم لەگەڵتدا بژیم، یان دەبێت بەو شێوەیە بیت کە من دەمەوێت، ئەوان بە تێگەیشتنو خۆشەویستی دەتوانن یەکتری قبوڵ بکەن، هەرچەندە جیاواز بیربکەنەوە.

٦- پیاوان زیاتر گرنگی بە کاروبارە گەورەکان دەدەن، نابێت گرنگی نەدانی هاوسەر بۆ هەندێ شت بکرێتە کێشەو ناکۆکیو لۆمەکردن، چونکە سروشتی پیاو بەو جۆرەیە، بۆ نموونە: لە پرسیارێکدا کە لە کۆمەڵێك پیاو کرابوو دەربارەی ڕەنگی چاوی دایکیان، لە ٩٠٪ گومانیان لە وەڵامەکەیان هەبوو، لە کاتێکدا هەمان پرسیار لە ئافرەتان کرا ٩٠٪ وەڵامەکەیان ڕاست بوو، بەڵام دەبینیت لە کاروبارەکانی تردا پیاوان زۆرترین وەڵامو بەشدارییان هەیە.

کازم جەباری



# شۆڕشە بێدەنگەکە..

## کتێب، ئەو هاوڕێیەی
## کە هەرگیز لە یادمان ناکات!

ڕەنگە ئێمە زۆرێك هاوڕێو دۆستو ئازیزمان هەبێت، بە جێمان بهێڵت، مەرگ مەودامان نەدات، تووشی جیابوونەوەو دابڕان بین، بەڵام کتێب ئەو هاوڕێ بە وەفایەی ژیانە کە مەگەر ئێمە بێ جورئەتو بێ وەفابین بەرامبەریو بە جێی بێڵین، ئەگینا ئەو لە یادنامەکەیدا لە چاوەڕوانیدایە بۆمان.

لێرەوە دەڵێم زمانی کتێب وشەو ڕستەیە، هاواری کتێب، ئەو تۆزو گەردیلانەیە کە لێی دەنیشێت، چاوەڕوانە بیلاوێنیتەوە. ئەم هاوڕێ گەشبینەمان، جگە لە سوود هیچ شتێکی دیکە لە فەرهەنگەکەیدا نییە.

کتێب کاتێك مەست دەبێت کە لەگەڵ خوێنەرو هاوڕێ جیدیو دڵسۆزەکانیدا گفتوگۆو ئاڵوگۆڕی دوورگەکانی زانیاری دەکاتو تاوێك لە ئاوازەکانی هۆشیارییو ڕۆشنبیری بە بیرو ئەندێشەماندا دەچرپێنێت، چونکە دەزانێت ماهییەتی خۆراکی جەستەی کلۆڵ نا.. بەڵکو دڵو ڕۆحێکی برسی چەند کتێبێکی پڕمەعریفەو پڕئەزموونە، شەرابی مەعریفە یانی زانین کە یەکسانە بە هۆشداریو ئاگایی، کۆی ئەمانەش دەکاتە پرۆسەیەکی ڕۆشنبیری لە سایەی مەشخەڵی شۆڕشە بێدەنگەکە، هەروەك زۆرجار خوێندنەوەی کتێب بە خۆمان بزانین، یان نا، وەك شەپۆلێك تەوژمی شۆڕشێکی بێدەنگ لە هەناوماندا دەسازێنێت.

کتێب بوونەوەرێکە زمان دەپوشکێنێت، مرۆڤ دەهێنێتە قسە، نەك ئەوەش بەڵکو فێری ئەتەکێتو ماناو دەربڕینو هونەری قسەکردنمان دەکات، کتێب مرۆڤ دەکات بە جێنتلمان، کتێب مرۆڤ دەکات بە ڕووناکبیر، ئەدیب، فەیلەسوف...

کتێب مرۆڤ دەکات بە شۆڕشگێر، لە سایەی شۆڕشی مەرەکەب، کتێب زانستە، ئەدەبە، تەکنەلۆژیایە، فەلسەفەیە. کتێب ژیانە، زاخاوی مێشکە، زامنی هیوایە.. کتێب هەستو نەست دەجوڵێنێت، کتێب بەختەوەریو ئاسودەیی بەرهەمدێنێت!!

بۆیە تۆ.. کتێب نەخوێنیتەوە تێناگەییت، لەگەڵ کتێبدا نەژیت، پێناگەیت، لە ناو کتێبدا نەتوێیتەوە ئەزموون وەرناگریت، ڕێز لە کتێب نەگریت بە هاوڕێی نابیت، بڕوات پێی نەبێت ڕۆشنبیر نابیت!!

ع. ش. شێرکۆ




# نازدار

پێشکەشە بەخێزانە ئەنفالکراوەکانی گەرمیان

خەریکبوو دەبووە دڵۆپێك ئاو، دنیای لێ هاتبووە یەك، حەزی دەکرد زەوی شەق بێ‌و لە سینگی خۆیدا حەشاری بدا، ئاسمان وەك هەڵۆ بیفڕێنێ‌و ئیدی جارێکی تر نێوی بەسەر زاراندا نەیەت.

ئاخر ئەو کەی سواڵی کردووە؟ کەی زانیویتی دەست پانکردنەوە چییە؟! کەی بە دووی ناندا ماڵان گەڕاوە..

ئەو دەمەی نازدار کچە عازەب بوو، قەشەنگترین‌و چاپوکترینی کچانی گوند بوو بە شەرم‌و وردبین‌و سەنگین، وریاو ئازا هێندەی چوار کابانی کار دەکرد، وەختێك بۆ کۆڵەدارو تەپاڵەو گسك دەچوونە دەشت، کۆڵی لە هەموو قورسترو لە پێش هەمووشیاندا دەکەوتە ڕێ، دەچووە سەر ئەو کەلەی بەسەر ئاواییدا دەیڕوانی‌و تا ئەوانی دەگەیشتێ تاوێ دادەنیشت، لە دوایی ڕا بانگی دەکردن: کچێڵ خێراکەن هەی باوانتان نەشێوێ!

کە دەگەییەوە ماڵێ نەیدەهێشت ماندووی وەحەسێ، چاوی بە ماڵەکەیاندا دەگێڕا بۆئەوەی بزانێ چی نارێکەو چی ناتەواوە.

کە شووشی کرد، هاوسەرەکەشی هاونموونەی ئەو بوو، پێکەوەنەری خێزانێکی بەختیارو کامەران بوون، هەندێك پەنجەی حەسوودی‌و هەندێك پەنجەی خۆزگەی بۆ ڕادەکێشان..

ئێستا بە تەنیا باڵی ماوەتەوە، مێردو براو کەسی وێکڕا بەرشاڵاوی ئەنفال کەوتن، خۆی‌و چوار منداڵی بێ سەروپێچك لە ژوورێکی داڕووخاودا دەژین، شەوانە پرسیاری منداڵەکانی تەواو نیگەرانیان دەکرد، ئەو پرسیارانە زریانێك بوون هەستو سۆزیان زۆر بێ ڕەحمانە دەشەمزاند، چ وەڵامێکی پێ نەبوو تا دڵنیایان بکات، بۆ وەڵامدانەوە دەشڵەژاو ڕەنگی زەرد دەبوو، نەیدەزانی چییان وەڵامدا!

دووانەچکۆلەکەیان دەیانپرسی: دایکە مامۆستا داوای لێکردین هەریەك باسی ئەوە بکات کە باوکی دەگەڵ خۆیدا بۆ سەیران‌و گەشت بۆ کوێی بردوون.

هێدی گوتی: دایکە ئەمن دەستم کرد بە گریان، نەمدەزانی چ بڵێم، گوتم: مامۆستا ئەمن باوکی خۆم نەدیوە!

ئەتۆ گوتت: باوکتان چووە لە شارێکی دوور کار بکاو هاکا گەڕایەوە، کەچی ئەمڕۆ لە مەکتەب قوتابییەکان گوتیان: مامۆستا هێدی باوکی مردووە! توخوا ڕاست دەکەن دایە؟!

سۆما چکۆلەترین منداڵ بوو، زۆر بە ساکاری دەیپرسی: باشە دایە باوکم بۆ هەر جارێك ناگەڕێتەوە سەرێکمان لێ بدات؟!

باشە دایەگیان باوکم بە ڕۆژانی هەینیش کار دەکات، بە جەژنیش کار دەکات، بە شەوانیش هەر کار دەکات، بە ڕۆژانی پشووش هەر کاردەکات؟!

دایکە ئەی تۆ قەت ناچیتە سەردانی باوکم؟ دایکە گیان ئەگەر چوویت پێی بڵێ: دەبا بۆ ئەم جەژنە بووکەڵەیەکم بۆ بکڕێت، تەوقەیەکیش، دایە تەوقەیەکیش، ها ئەوانەی کچانی پۆلەکەمان لە نێوەڕاستی سەریانی دەبەستن.

سۆما بەو چکۆلەییەی لە قسان نەدەوەستا!

دایکی خەریکبوو دەبوو بە قەقنەس، قرچە لە جەرگییەوە دەهات، ئازای گیانی دەلەرزی، سەدای گریانێك لە گەروویدا پەنگی خواردبووەوە ئەگەر بەربەستەکان نەبوونایە دەگەیشتە هەموو دنیا.

سۆما دەیگوت: دوێنێ کچێك پرسی: باوکت ئێواران هیچتان بۆ دێنێ، نەء، ئەی شیرینی؟ نەء، ئەی باوکت ئێواران دەگەڕێتەوە؟ نەء، ناچنە باخچەی گشتی؟

نەء، میوانتان دێ؟ نەء.

دایکە ئەو چی گوت، ئەمن هەردەمگوت: نەء، ئەویش ڤاڤا پێم پێکەنی!

دایە ئاخر چی وەڵام دەم؟!

ئەم پرسیارانە بێ وەڵام بوون، نازدار نەیدەزانی چی بڵێ، ئەسرین زەنگۆڵ، زەنگۆڵ، بەسەر گۆنایدا دەهاتنە خوار، دەباوەشی دەگرتن، پاشان سەری دەخستنە سەر ڕانیو بەڵێنی دەدانێ..

ڕۆڵەکانم، حەتمەن باوکتان هەر دێتەوە، دوانەکەی تر گەورەتر بوون، (خەبات) تەمەنی پانزەساڵانو (ئاوات)یش تەمەنی نۆ ساڵان بوو، دەیان فامییەوە کە گوێیان لەم قسانە دەبوو گرمۆڵە دەبوون، ڕوویان گرژ دەبوو، زمانی خۆیان دەگەزی، زۆرجار ئەوانیش دەستیان بە گریان دەکرد.

ئەوان سەوداسەری عەشقێکی فرە زەرروور بوون، بێ سۆزی ئەو عەشقە نەیاندەکرا، بە یادی ئەو عەشقەوە مۆمی تەمەنیان تروسکەی تێدا مابوو!

ئەورۆ نازدار لە ماڵێ ڕا هاتە دەرێ، دوو ڕۆژە تەنها نانی ڕەق نەبێت هیچیان نەخستووەتە سەر زاریان.

منداڵەکان لە برسا بڕستی هاتنە دەرەوەیان نییە، سۆماو هێدی دوو ڕۆژە نەچوونەتە مەکتەب، خەباتو ئاوات لە برسا وشك هەڵاتوون، دوێنێ چووبوون پاشماوەی خواردنی دەرودراوسێیان چنی بووەوە.

ویستی بە هەر شێوەیەك بێت نەیەڵێت منداڵەکانی لە برسا بمرن، بەیانی زوو لە ماڵێ وەدەرکەوت، ئەوی شەوێ (محەممەد)ی هاوسەری هاتبووە خەونی، لە خەوەکەدا زۆری لێ پاڕابووەوەو وەسیەتی بۆ کردبوو: نازدار تۆو ئەو منداڵانە، ئەمن لێرەش هەر دڵم لای وانە نازدار!

بەدەم ڕێوە بیری لە خەونەکە دەکردەوەو دەیگوت: ئاخر من چی بکەم چی؟

بێئەوەی ئاراستەی خۆی بزانێت هەنگاوی دەنا، بە لای خانووی زۆر جوانو قەشەنگدا تێپەڕی، چاوی بە ماڵی زۆرێك لە شۆڕشگێڕانی دوێنێو بازرگانانی ئەمڕۆ کەوت، چەندجار بە خەیاڵیدا هات، سەردانی یەکێکیان بکاتو سکاڵای حاڵی خۆیانی بۆ بکات، بەڵام ویژدانی ڕێگەی نەداو سەربەرزیو غیرەتی نەفسو شەرەفی کوردانەی ڕێگایان پێنەدا، ئەو خەیاڵانەی مێشکی وەدەرناو بەرەو بازاڕ هەنگاوی نا، بەڵکو کارێکی دەستکەوێتو بژێوی منداڵەکانی پەیدا بکات.

سلێمانی/ بەهاری/ ١٩٩٤

# وتەی پڕ لە ئامۆژگاری

ئا: ڕەوا بەرزنجی

* دانایەك گەنجێکی بینی، زۆر ڕووی خۆشبوو، لەگەڵی دوا، هیچ زانستی پێ نەبوو، داناکە وتی: چاکترین ماڵە ئەگەر ئاوەدان بووایە!

* دەگێڕنەوە لە شێوێکدا گورگێك بەرخێکی بینی، گورگەکە برسی بوو، بە بەرخەکەی وت: ئایا تەشریفت نایەت بۆ ماڵمانو میوانداریمان بکەیت؟ بەرخەکە بە ترسو لەرزەوە وەڵامی دایەوەو وتی: زۆر حەز دەکەم ماڵی بەڕێزتان ببینم، بەڵام دەترسم دوا میوانداریم بێت!

* ئەو مرۆڤەی دەیەوێت بەبێ هەوڵدان، بە ئاواتەکانی بگات، وەکو ئەو خەوتووە خەوخۆشە وایە کە بەخەبەرهات، لەسەر حەسیرە شڕەکەی خۆی دەبینێتەوە.

* جارێکیان منداڵێك هەڵەیەکی کرد، گەورەکەی ویستی لێی بدات، منداڵەکە وتی: من بەبێ عەقڵی هەڵەم کرد، تۆ بە عەقڵەوە مەکەوە هەڵەوە.

* زمان ڕابێنە لەسەر قسەی حەق،
بە ئەدەب، نەوەك بە شێوازی ڕەق.
ئەو پارچە گۆشتەی لەناو دەمایە
کلیلی دەرگای خێرو بەڵایە
هەروەکو دەرگای خێر دەکاتەوە
سەری زۆر بەڵاش هەڵ دەداتەوە.

* زانایەکی بە ساڵاچوو نەخۆش کەوت، کۆمەڵێك لاو بۆ سەردانی چوون، زۆر لە لای مانەوەو قسەی خۆشیان کرد، کاتێك کە هەستان بڕۆن، بە زاناکەیان وت: دوعای خێرمان بۆ بکە، زاناکەش وتی: خوایە فێری ئادابی سەردانی نەخۆشییان بکەیت!

*** پێنج شت پێویستی بە پێنج شتە:**

١- ژیری پێویستی بە تاقیکردنەوەیە!

٢- تەمەن پێویستی بە تەندروستییە!

٣- سامان، پێویستی بە قەناعەتە!

٤-پلەوپایە، پێویستی بە نەرمونیانیە!

٥-خۆشەویستی، پێویستی بە ئەدەبە!

*** هاوڕێی چاك ئەو کەسەیە:**

١- نهێنیت بپارێزێت.

٢- کەموکوڕییەکانت بپۆشێت.

٣-لە خۆشیوناخۆشیدا لەگەڵتدا بێت.

٤- چاکەکانت بڵاوبکاتەوە.

٥- هەوڵی کەمکردنەوەی خراپەکانت بدات.

٦- منەت نەکات بەسەرتا.

٧- دڵسۆزو بەسۆز بێت بۆت.

٨- بەڕێزەوە بۆت بڕوانێت.

٩- لە دڵو دەروونو وتەو کردەوەدا پاك بێت بەرامبەرت.

*** پێنج شت مرۆڤ ڕێزدار دەکەنو پێی دەگەیەنن:**

١- بێدەنگی.

٢- وازهێنان لەوەی پەیوەندی بە تۆوە نییە.

٣- وردبوونەوە لە گوناهەکانی خۆیو چاککردنیان.

٤- وازهێنان لە عەیبو کەموکوڕییەکانی خەڵکی.

٥- کارکردنو پاراستنی نهێنی.

* لوقمانی حەکیم لە ئامۆژگارییەکیدا بە کوڕەکەی خۆی گوت: کوڕم پرسوڕاوێژ بە ئەزموونندارەکان بکە، چونکە بە بێ بەرامبەر لە بیروبۆچوونی خۆییت دەداتێ، لە کاتێکدا ئەو بە هەوڵو کۆششو سامان دەستی کەوتووە.

بەشی یەکەم



درەخشان بەهادین

# دایك..
# گوشراوێك لە تەواوی میهرەبانی

ڕۆڵی دایك لەسەر ژیانی مرۆڤەكان زۆر گرنگو كاریگەرە، دایك بەردی بناغەی گەشەی سۆزداریو كەسایەتی تاكەكان دیاری دەكاتو بنیات دەنێت.

ئەوە كە بە سانایی نیازو خواستەكان، بەهەرەو دەردو ناڕەحەتیەكانی منداڵ هەست پێ دەكاتو جیا دەكاتەوە، هەر بۆیە جۆری وابەستەیی منداڵ بە دایكەوە، یاخود شێوەی پەیوەندی نێوان ئەو دووانە بە بنچینەی پەیوەندی كۆمەڵایەتیو ڕادەی هۆگرییو موحیبەتی تاكە كەس دەناسرێتو پێناسە دەكرێت.

بۆئەمەش لێكدانەوەی ڕۆڵی دایك لەسەر داو بە داوی ژیانی مرۆڤەكان بە لەبەرچاوگرتنی تێڕوانینی گرنگی دەروونناسان دەخەینەڕوو:

دایك یەكێكە لە سیستەمە بنچینەییو بنەڕەتییەكانی پێكهاتەی خێزان، كە ڕووەو ئاڕاستەی سەركەوتنو شكستی هەر تاكێك لە ژیان دیاری دەكات.

لەسەر بنەمای دیدی (توێژەرەوانی دەروونناسی) شێوەی تایبەتی كەسێتی تاك لە منداڵیدا، بەشێوەیەكی گشتی تا ئەو كاتەی پێ دەنێتە نێو دونیای بوونو ناسینی خودی خۆی، بە ئاگایانەوە لەسەر ئاكارو هەڵسوكەوتی دایكوباوك پەروەردە دەبێتو گەشە دەكات. كە تا ئەو كاتە تەواوی ڕەفتارەكانی منداڵ بە ئاڕاستەی خۆویستیو وەرگرتنی زۆرترین چێژی خۆشییە، زیاتر ئارەزوومەندانەیە.

بۆ ئەمەش دایكوباوك بە تایبەتی دایك بە ناوی نوێنەرانی كۆمەڵگا هەوڵ دەدەن خواستە ڕاستەقینەكانو بەها ڕەوشتییەكانی پێ بناسێننو فێر بكەن.

هەر لە سەرەتاوە منداڵ لە ڕێی دایكییەوە سەرگەرمی چۆنیەتی خۆشویستنە، ئەوەی كە دایك چۆنو بە چ شێوەیەك وەڵامی دەبێت بۆ خواستەكانی منداڵ كە بە تەواوی ئارەزوومەندانەیە لە ڕووی حەزەكانییەوە، ماهیەتی دونیای بچووكی منداڵ دیاری دەكات، بە جۆرێك كە ماناكردنو دیدو تێگەیشتنی ئێمە سەبارەت بە ژیانی دونیا بەوەی كە جێگەیەكی ئارام، چاكو جێگەی دڵخۆشییە، یا نا ئارامو خراپو پڕ مەترسییە، ئەنجامو ڕەنگدانەوەی جۆری دیدو تێگەیشتنو لێكدانەوەی شێوەو ڕووی ژیانی دونیایە لە لایەن دایكانمانەوە لەسەر ئێمە، دایكێكی تا ئەندازەیەك باش دایكێكە كە بتوانێت نیازو پێویستی منداڵەكەی دیاری بكات. بزانێت لە چ كاتێكدا، بە چ ئەندازەیەكو چۆن ڕازی دەكات؟

ئەمە گەورەترین بەرپرسیارێتی دایكێكە، ڕازیكردنی منداڵ بە شێوەیەكی نادروست، بە كەم، یان بە زیاد لە ئاستی نیازەكانی چارەنووسی منداڵ دەخاتە ڕێڕەوێكی هەڵدێرو لادانەوە بەبێ ئەوەی خۆی بزانێتو بیەوێت.

بۆ نموونە ڕازیكردنی منداڵو ڕاهێنانی زیاد لە ئەندازەی پێویستو بە شێوەی گوفتاریو ڕواڵەتی دەبێتە هۆی ئەوەی كە كەسێكی زیاد لە ئەندازە گەشبین بێتو هۆگرو پەیوەست بێ بە كەسانی ترەوە، بەشێوەیەكی نائاسایی سادە بێت، بە چاوی داخراوەو هەموو شتێك قبوڵ دەكاتو بەشێوەیەكی ڕەها باوەڕ بە كەسانی دەوروبەری دەكات، كە لە ڕووی زمانەوانییەوە بەو جۆرە كەسایەتیانە دەوترێت (كەسایەتی زارەكی).

دایك، لە شێوەگرتنی كەسێتی (من) ڕۆڵێكی بنچینەییو سەرەكی هەیە، هێزو توانای (من) دەبێتە هۆی ئەوەی كە تاك سۆزو ئەوینی خۆی بە شێوەیەكی بەجێو دروست بەڕێوە ببات، كاتێك

(من) بەشێوەیەکی چاکو دروست شێوە دەگرێت، تاك لەگەڵ دونیای دەوروبەری خۆیدا هۆشمەندانەو دروست هەڵسوکەوت دەکات، توانای هەستکردن، دیاریکردن، بڕیاردانو ژیری خۆی پەروەردە دەکات. فرۆید ئەم توانایە بە دووەم بەرهەمی بیروئەندێشە دەزانێت.

ئێمە دەزانین کە ئەم توانایە گەورەترین سەرمایەی سەرکەوتنی ئێمەیە لە ژیاندا.

پیاوانی سەرکەوتوو، ئەو منداڵانەن کە دایك بێ هیچ مەرجو بەندێك خۆشیان ویستوونو دۆستیان بوون.

فرۆید دەڵێت: منداڵێك کە بێ هیچ مەرجێك دایکی خۆشی ویستووە، لە تەواوی ژیانیدا هەستی کەسێکی سەرکەوتووی هەیە، هەستی دڵنیایی لە سەرکەوتن، کە زۆرجار هۆکاری هاتنەدی سەرکەوتنی ڕاستەقینەیە.

موحیبەتی بێ بەرامبەر، یان قبوڵکردنی ئەرێنی بێ مەرجو ئامێزی هەمیشە واڵای دایك، لە ڕەفتارەکانی دایکانی سەرکەوتوو دێتە ئەژمار، ئەوان بە دڵنیاییو باوەڕ بەخۆبوونەوە ڕەفتار دەکەنو هەڵەکانی ڕۆڵەکانیان ناخەنە ئەستۆی خۆیانەوە، هەربۆیە ئامادەن تا بێ هیچ بەندو مەرجێك کەسایەتی منداڵەکانیان هەر بەو جۆرەی کە هەن قبوڵ بکەن، لە بیرمان نەچێت دایکانێك کە بە بەندو مەرج، چوارچێوەیەکی ڕەفتارو هەڵسوکەوت بۆ منداڵەکانیان دادەنێن، بە پەیڕەوی کردن لێی ڕازی دەبن تا ئامێزی موحیبەتیان بۆ ڕۆڵەکانیان واڵا بکەن، خۆیان باشتر لە هەر کەسێك ئەو ڕاستییە دەزانن کە بەندو مەرجی ئەوان وەها کارساز نابێت، منداڵانیش بە چاکی لەو ڕاستییە گەیشتوون کە دایك سەرچاوەی سۆزو میهرەبانییەو هیچی تر، دایك گوشراوەیەکە لە تەواوی میهرەبانی، هەر لەبەرئەوە بەشێوەیەکی گشتی لێدانو توڕەبوونی دایك لەسەر منداڵ کاریگەر نابێت.

لە ڕاستیدا دەبێت بڵێین: کە ئەم دەستەیە لە دایکان، تەنها لە ئەرزشو ڕێزی خۆیان کەم دەکەنەوەو دەبنە هۆی دروستبوونی دووریو بۆشاییەکی سۆزداری لە نێوان کەسایەتی خۆیانو ناخو هزری منداڵ.

ئا: هۆشمەند سادق



# چۆنێتی خۆراهێنان لەسەر خۆڕاگری

خۆڕاگری بەهرەیەکی خواییە لە دڵی هەموو مرۆڤێکدا بەشێوەی کەم، تا زۆر هەیە، هەر کەسێکیش گەر لە لوتکەی خۆڕاگریدا بێت ئەو کەسە بەردەوام لە ژیانیدا کەمتر تووشی هەڵە دەبێتو ئاهی پەشیمانی هەڵدەکێشێت، زیاتر بەرەوخۆشیو هیوا بە ژیانەوە دەژیت خۆڕاگری بەخشینێکە ناتوانین پشتگوێی بخەین، چونکە وەك هەناسەو ئاو لە ژیاندا پێویستمانە، لە ژیانی ڕۆژانەماندا زۆرکێشەو گیروگرفت دێتەڕێمان جا بە پێی کاتو جۆرەکەی پێویستمان بە خۆڕاگریو خۆ دروستکردنە بۆ خۆڕاگری پێویستە گەر لە ژیاندا بە کەمترین کات هەڵبچینو تووشی توڕە بوون بین، زۆرشت لە دەست دەدەینو دواتریش پەشیمانین لە دوای توڕەبوونەکەمان... بۆ نموونە توڕەبوون لە دەست باوك، یان برا، یا مامۆستا، کە کێشەکە بە توڕەبوون چارەسەرناکرێت... هتد. لێرەدا کۆمەڵێك خاڵ دەخەینە ڕوو کە بە هۆیانەوە دەتوانین خۆمان ڕابهێنین تاکەمێك بە ئاگابینو زیاتر خۆڕاگربین لە کاتی توڕەبووندا:

١- پشت بەهێزی ئیرادەمەبەستە، هێزوئیرادە بێکەڵکە ئەگەرشتێك نەبێت جێگیری بکات، بێکەڵکترە ئەگەر لەگەڵ ئەندێشەیە، یا تێگەشتندا دژ یەك وەستایەوە، بۆ نموونە: بەردەوام وێنەی ئەو کەسە بهێنە بەرچاوی خۆت کە کەسێکی لێبوردەو لەسەر خۆیەو ئارەزووی لە بەخشین و هاوکاری دەوروبەر هەیە.

٢- هەوڵ بدە لەو هەڵوێستانە بە دوور بیت کە سۆز دەجوڵێنن.. ئەگەر دەتەوێت خۆڕاگربیت باشترین ڕێگە ئەوەیە لەو هەڵوێستانە دووربکەویتەوە کە هەستو سۆزت دەخرۆشێنن، بە تایبەت ئەو هەستانەی کە ئارەزووی تۆڵەسەندنەوەو ڕقو کینەت زیاد دەکەن، چونکە ناتوانیت زاڵبیت بەسەریاندا، ئەوا دەتخنکێنن.

٣- ئەو وەرزشە بکە کە لەگەڵتدا گونجاوە.. هەوڵی ئەنجامدانی ئەو وەرزشانە بدە کە بۆ تەمەنو کاتو شوێنەکەت گونجاوە.

٤- دڵودەروونت لەو شتانە پاك بکەرەوە کە دەبنە هۆی زیان پێگەیاندنت، ڕابردوو ڕقوکینەو تۆڵەسەندنەوە چارەسەری کێشەو گیروگرفتەکانت نین، لە بیرکردنیان دەتگەیەنێتە لوتکەی بەختەوەری، بە پێچەوانەوە کاریگەری خراپت لەسەر دادەنێن.

٥- باس لە خەمەکانت بکە، باسکردنی کێشەو خەموخەفەتەکانی ژیانت بۆ هاوڕێیەکی دڵسۆزت، یان باوك، یان دایکت، یاخود کەسێکی شارەزای بوارەکە، هیچ کێشەیەك بێ چارەسەر نییە....

شێخانی

# دیکتاتۆرەکەت بڕوخێنە!



مرۆڤ سەیرترین بوونەوەرە، دەریای ڕازو نهێنی بێ سنورە، لە کۆنەوە تا ئێستا گرنگی زۆر بە ناخو ناوەرۆکو دەروونو هەستو نەستو مەیلو ئارەزووەکانی دراوە، وێڕای ئەوەی کە لە کتێبە ئاسمانییەکاندا، زۆر بە وردی وەسفی چۆنێتی خەڵقو پێکهاتەکانی مرۆڤو بواری دەروونیو ئاکاری کراوە، کە بێگومان ڕاسترینو ڕوونترین سەرچاوە بۆ ناسینی مرۆڤ وتەکانی پەروەردگارە، چونکە بەدیهێنەر لە هەموو کەس زیاتر شارەزای بەدیهێنراوەکەی خۆیەتی، دواتریش پەیامبەران بۆ ڕێنمایی مرۆڤەکان بە سرووشی خودایی بەرزترین ڕێنماییان کردووە.

هەموو ئەمانە گرنگی مرۆڤ دەردەخەن کە خودای گەورە ڕێزی زۆری لە مرۆڤ گرتووەو هەر خۆشی دەفەرمووێت:

﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ ﴾.

بۆ سەعادەتو سەرفرازی ئەوانیش خودا پەیامبەرانی بە پەیامی جۆراوجۆرەوە ناردووەو یەکەم پەیامی هاوبەشی نێوان هەموو پێغەمبەرانیش پەیامی ئازادیو ڕزگاربوونە لە کۆیلایەتیو پەرستنی غەیری خودا، ﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ ﴾.

ئەمەش چەقی ململانێی نێوان پێغەمبەرانو ملهوڕان بووە، بە درێژایی مێژوو.

مرۆڤ لە نێوان دروستکراوەکانی خودادا ڕیتمێکی سەیری هەیە، بۆیە هەندێك لە زانایان دەڵێن: مرۆڤ لە نێوان فریشتەو ئاژەڵدا نێوەندە، ئەگەر لە بەها بەرزەکانو ئاکارە مەزنەکان نزیك بێتەوە بەرەو ڕیزی فریشتان هەڵدەکشێ، وەلێ ئەگەر خۆی تەسلیم بە ئارەزووبازیو شەهوەتو مەیلی ئاژەڵی بکات ئەوا بەرەو ڕیزی ئەوان دێتەخوار.

هەندێکیش لایان وەهایە کە مرۆڤ هەموو سیفەتەکانی گیاندارانی لە خۆگرتووە، بۆ نموونە لە نێو گیاندارانداهەریەکەو بە سیفەتێکی خراپ ناسراوە، وەکو، سپڵەیی، فێڵبازیی، ئیرەییو حەسادەت، دڕندەیی، خودپەسەندی، چاوچنۆکی، ئارەزووی ستەمو زۆرداری، ...هتد

بەڵام دەبینین هەموو ئەمانە لە غەریزەی مرۆڤدا بەدی دەکرێن، ئەگەر خۆیان لێ ڕزگار نەکاتو تەهزیبی ئاکارو ئارەزوو هەوادارییەکانی نەکات، لەبەرئەوە مرۆڤی نەخوێندەوارو بێماریفەتو نەزانو نەشارەزاو بێ ئامانجو بێ هونەرو بێ سوود. سەرچاوەی ستەم و نەزانیو خودپەسەندیو غرورو خۆبەزلزانینو بە خۆوە نازینو تەماشاکردنی کەسانی ترە بەچاوی سووك.

قورئانی پیرۆزیش مرۆڤ دوور لە نووری هیدایەتو ڕۆشنایی شەریعەتو زانستو زانیاریو ماریفەت بە کەسێکی نەزانو ملهوڕ لە قەڵەم دەدات،

﴿ إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ﴿٧٢﴾ ﴾

کەواتە سەرەداوی هەموو کێشەکان مرۆڤ خۆیەتیو ئەگەر هەموو دونیا بگۆڕین، هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت، تا مرۆڤەکان لە جەوهەری خۆیاندا نەگۆڕێن.

چونکە مرۆڤەکان ئەگەر نەیانتوانی بەسەر لایەنی شەڕدا زاڵبن لە خودی خۆیاندا، لە دوو کەس بە دەر نابن، یا دەبنە دیکتاتۆرو چەوسێنەرو مەلۆزم، یا دەبنە دروستکارو نۆکەری دیکتاتۆرەکان!

کە هەردووکیان دوو بەڵای گەورەن، بەشێوەیەك هەندێجار نە دیکتاتۆر ڕازی دەبێت، لەسەر تەخت بێتە خوارێو نە زورنا ژەنەکانی دەوریشی دەتوانن لەو نەریتەیان دەست هەڵگرنو وەکو مرۆڤێکی ئاسایی بە عیزەتەوە بژین!

کەواتە پێویستە سەرەتا لە ناخی خۆماندا ئەهریمەنی دیکتاتۆریو ملهوڕیو ستەم لەناوبەرینو ڕازی بین لەگەڵ مرۆڤەکاندا وەکو برا بە خۆشەویستیو هاوکاریو هاوبەشییەوە بژین.

بێ جیاوازییو ڕەگەزپەرستیو دەمارگیری و خودپەسەندی.

دروستبوونی وەها مرۆڤێکیش سانا نییەو پەروەردەو ڕۆشنبیریو ڕاهێنانو پیادەکردنی دەوێت، ئەگەرنا لەگەڵ لەناوچوونی دیکتاتۆرێکدا، دەستەو نەزەر پێشوازی لە دیکتاتۆرێکی تر دەکەین!